

بەرهەم و نووسراوەکانی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود (٤)

# کێشە کۆمەڵایەتییەکان

## و چارەسەریان لە ئیسلامدا

سەلەم، شوفعە، وەسیەت و ڕاسپاردن، ڕەهن یان بارمتە، بەخشین،
کشتوکاڵ و بەدەم چاندن، ڕەوێی و ئاوەڕگەی گوندنشینەکان، قەرزارو خاوەن قەرز.

نووسینی: ئەحمەد کاکە مەحموود



خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی:

عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود



# ناسنامەی کتێب

🕮 ناوی کتێب: کێشە کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەریان لە ئیسلامدا

✍ نووسینی: مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود "بەڕەحمەت بێت"

❁ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی: عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود

❁ نۆرەی چاپ و ساڵی چاپ: یەکەم /١٤٣٩ هـ - ٢٠١٨ م .

❁ تیــراژ: ١٠٠٠ دانە.

❁ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٨٧) ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە.

❁ دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

❁ نەخشەسازی ناوەوە: مەهرین دیزاین.

❁ شوێنی چاپ: ناوەندی ڕێنوێن.

# پێشەکی ئەم بەرهەمە

الحمدلله، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده..

سوپاس و ستاییشی بێ پایان بۆ خودای بالاً دەست و بە توانا، سەلات و سەلامیش لەسەر گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی "موحەممەد" ﷺ وە ئال و یارانی و شوێنکەتووانی بێت، وا ئەمجارەش لە "زنجیرەی بەرهەم و نووسینەکانی مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود" لە نوێترین بەرهەمی چاپنەکراوی مامۆستادا بە ناوی (کێشە کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەریان لە ئیسلامدا) دێینەوە خزمەت ئێوەی بەرێزو خۆشەویست، لەم زنجیرەیەدا مامۆستای رەحمەتی مەبەستی سەرەکی خستووەتە ڕوو دەنوسێ:

<u>یەکەم</u>: دەبێ مرۆڤ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە تێرو تەواوی شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت بێت، ئەگینا ئیمانی دانەمەزراوەو کاڵ و کرچە " ئەگەر لە دین دەر نەچێت " وە لە هەموو کێشە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەکاندا، دەبێ لە ئیسلامدا چارەیان بۆ بدۆزنەوە، نەك دابەشیان بکەن: هەرچی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە، وەکو باری کەسێتی: (الأحوال الشخصية) و مەسەلەی دەسنوێژو بەچی دەشکێ، ببرێنەوە بۆ مزگەوت، هەرچیش کێشە سیاسییەکانە – لەتەشکیلەو پەیکەری دەوڵەت– ببرێنە کۆشکی سپیی و بەریتانیاو ئەڵمانیاو ئەوروپا بەگشتیی!! بۆیە ئێمە هەمیشە دەڵێین: هەرکەسێك بەلایەوە وابێ ئەم دینی ئیسلامە کەم و کورتییەکی تێدایە، ئەوە لەدین لایداوەو پێچەوانەی دەقی ئایەتەکان جووڵاوەتەوە.

<u>دووەم</u>: لەم زنجیرەیەدا " کێشە کۆمەڵاتییەکان وچارەسەریان لە ئیسلامدا " کێشەکانی وەك: (قەرزارو خاوەن قەرزو وامدان، زەویی و لەوەڕگەی گوندنشینەکان، کشت و کاڵ و نەمام چاندن، ڕەهن یان بارمتە، بەخشین یان هیـبـە، سەلەم، شوفعە، وەسیەت و ڕاسپاردن) چارەسەرێکی شەرعییانەیان بۆ دەنووسین، وە ئەو هۆکارانەی پاڵیان پێوە نام بۆ نووسینی ئەم جۆرە باسانە، ئەمەبوو کە: کۆمەڵگا هەر وەکو لە مەسەلە سیاسییەکاندا لە

ئیسلام ترازاوەو بە ئارەزووی خۆی گەزوو پێوانەی دەکا، هەر ئاواش لەمەسەلە کۆمەڵایەتییەکاندا چورتمی داوەو بەپێی بەرژەوەندی خۆیان لەسەریان پێکدێن! بێ ڕەچاوکردنی بابەتە شەرعییەکان تیایاندا، جا لەمەوە گەلێ ناهەقیی و ستەم لە یەکتر دەکەن و، گەلێکیش هەراو کێشەی لێدەکەوێتەوە، وە ئەو جۆرە کێشانە گەلێ جار دەبنە هۆی بچڕانی پەیوەندییەکانی نێو کۆمەڵگەی کوردەواریی و، زۆرجاریش کێشەی گەورە دەخولقێ و بە هەزاران پیاوی ریش سپیی و مەعقول ناتوانن چارەسەری بکەن، بۆیە بە یارمەتی خوا بە شێوەیەکی کورت و پوخت ڕێگاچارەم بۆ هەر یەك لەو کێشانە داناوەو هیوادارم موسڵمانانیش گوێرایەڵ و ئیتاعەی فەرمایشتەکانی خواو پێغەمبەری خوابن.. ئەمە بوو مەبەست و ویستی مامۆستا لە نووسینی ئەم زنجیرەیەدا، ئیتر لە پەنای خوادا بن و چاوەڕێی بەرهەمێکی نوێی دیکەی مامۆستای ڕەحمەتی بن بە یارمەتی خوا.

**عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود**

**سەرپەرشتیاری پرۆژە بانگەوازییەکانی**

**مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود**

**Web: www.ahmadkaka.org**
**Mail: erfankaka77@gmail.com**

**سلێمانی / ١٣ ی شەوالی ١٤٣٩ ک – ٢٧ / ٦ / ٢٠١٨ زایینی**



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إن الحمدلله نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ (آل عمران:١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ (النساء /١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٧٠ـ٧١).

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله تعالى، وخير الهدى هدى محمد ﷺ، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة فى النار.



# ١- قەرزارو خاوەن قەرزو وامدان

## دەسپێک:

گشت خەڵکانی دنیا چاك دەزانن کە: دینی ئیسلامیی پیرۆز چەندە گرنگیی و بایەخ دەدا بەلایەنی (ئەخلاقیات) و (قییەم) و ڕەچاوکردنیان لەهەموو بوارەکانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا، چونکە مرۆڤ لای ئیسلام لەهەموو شتێ بە حورمەت ترو بە قەدر ترە، لەولایشەوە پێکەوە ژیانی کردۆتە بنەمایەکی سەرەکیی بۆ ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی، واتە: ئەم وەکو جووڵەندەو باڵدارو پاتاڵەکانی تر نییە، بێ لە یەکیش ژیانیان بۆ بچێتە سەر ! نەخێر.. پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان شتێکی سرووشتیی و زگماکیی و (**فطرە**ت)ییە، بەدەر لەوەیش خوای بەدیهێنەر وای بۆ بڕیونەتەوە وەکو خۆی لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿ ... نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ (الزخرف: **٣٢**)

بەڵێ خوای گەورە خۆی ئەم یاسایەی بۆ دیارییکردوون کە: دەبێ پێکەوە بن و هۆگری یەکبن و تەواوکاری کەم و کورتییەکانی ژیانی یەکتربن، چونکە ناکرێ لە ژیان و ژیواردا مرۆڤەکان هەموو وەکو یەکبن..

ئەمەش بەڵگە نەویستە بەڵکو هەندێکیان لە چاو هەندێکیان پایە بەرزترن و ماڵی دونیایان زیاترە، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا هەندێکیان ڕاژەو خزمەت بە هەندێکیان بکەن، چونکە یەکێ ئەندازیارەو، یەکێ تریان وەستا بەنایەو، کەسێکی تر کرێکارە...هتد. جا لەم پێکەوە ژیانەدا ئەگەر بەرامبەر یەکتری لێبوردن و (سەماحەت)یان نەبێ، هەرگیز ناتوانن ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەو بێ هەراو بێ قڕە بگوزەرێنن، ناتوانن کۆمەڵ و کۆمەڵگەیەك پێکبێنن پڕ بێ لە قەدرو حورمەت بۆ یەکتری، ناتوانن برایەتی بکەن و گشت ببنە برای یەکتر، وە ببنە یەك جەستەو لە خزمەتی یەکتردابن، جابۆ فەراهەم هێنانی پێکەوە ژیان و لێبوردن بەرامبەر بەیەکتر، خوای گەورە لە زۆرێکی زۆرینەی قورئانی پیرۆزدا، بەشێوەیەکی گشتیی و گشتگیرانە فەرمان بە (عەدالەت) و (ئیحسان) دەدا، بۆ نموونە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ

وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ (النحل: ٩٠). **یان دەفەرموێت:** ﴿ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴾ (النساء: ٣٦) . **دیارە کە: ڕێ لە پێچەوانەی (عەدالەت) و (ئیحسان)یش دەگرێت..** ﴿وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ ﴾.

جا ئەم دەسپێکە دەکەمە دەرگای چەند مەبەستێکی مەزن و گەورەو زۆر پێویست بۆ ئەمڕۆی کۆمەڵگەکەمان، وەکو باسی دەستەواو قەرزدانە یەکترو، پاشان شێوەی وەرگرتنەوەی، ئەوجا مەسەلەی زەویی و زارو لەوەڕگەو ئاوەخۆرەی گوند نشینەکان و کشت وکاڵ و نەمام چاندن و، ڕەهن و بارستە لەبەرامبەر قەرزەوە... هاوکات لەگەڵ چەند باسێکی تردا، لە ژێر ناونیشانی: (کێشە کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەریان لە ئیسلامدا).

ئەو هۆکارانەیش پاڵیان پێوە نام بۆ نووسینی ئەم جۆرە باسانە، ئەمەبوو کە: کۆمەڵگا هەر وەکو لەمەسەلە سیاسییەکاندا لە ئیسلام ترازاوەو بە ئارەزووی خۆی گەزوو پێوانەی دەکا، هەر ئاواش لەمەسەلە کۆمەڵایەتییەکاندا چورتمی داوەو بەپێی بەرژەوەندی خۆیان لەسەریان پێکدێن! بێ ڕەچاوکردنی بابەتە شەرعییەکان تیایاندا، جا لەمەوە –بێجگە لە مجرۆبوونی ڕۆژی قیامەت و سزاو تۆڵەی ئەو ڕۆژە– گەلێ ناهەقیی و ستەم لە یەکتر دەکەن و، گەلێکیش هەراو کێشەی لێدەکەوێتەوە..

دەخوازم لەخوای باڵادەست و لەکارزان و کارجوان فەڕو پیت بخاتە ئەم نووسینەوەو کۆمەڵگاکەشمان گشت ڕەفتارو گوفتارێکی "موسڵمان" بکات.

جا وا بەیارمەتی خوای پەروەرێنمان لە قەرزارو خاوەن قەرزەوە دەست پێدەکەین و، پاشان زەویی و زارو لەوەڕگەو ئاوەخۆرەی گوند نشینەکان و هەروەها..

١٤/٤/١٤٢٤ ک

١٤/٦/٢٠٠٣ ز

**هەڵەبجەی شەهیدان**



## ڕەحمەتی خوا لەو خاوەن قەرزە بێت بە جوامێرانە داوای قەرزەکەی بکاتەوە

پێغەمبەری دڵسۆز بەگشت مرۆڤایەتی دەفەرموێ: ((رحم الله رجلا سمحاً إذا باع، وإذا اشترى، وإذا اقتضى))[1]. واتە: خوایە ! ئەو مرۆڤە بەر ڕەحمەت و دلۆڤانی خۆتی بخە کە بە شێوەیەکی مەردانەو جوامێرانە شتوومەك دەفرۆشێ و، دەکڕێ، داوای قەرزی خۆی دەکاتەوە. پێشەوا (تیرمیزی)یش ئەم فەرمودەیەی هێناوە: ((غفر الله لرجل كان قبلكم، كان سهلا اذا باع...))[2]. واتە: خوای دلۆڤان لەو پیاوەیە بووریی و خەتاکانی پۆشی – کە بەر لە ئێوە دەژیا – چونکە هەمیشە بەئاسانیی و جوامێرانە مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی دەکرد، هەروەها ئەم فەرموودەیەش دێنێت: ((إن الله يحب سمح البيع، سمح الشراء، سمح القضاء))[3]. واتە: بێگومانبە کە خوای بەبەزەیی کڕین و فرۆشتن و قەرزدان و وەرگرتنەوەی بە شێوەیەکی جوامێرانەی خۆشدەوێت.

(نەسایی) ئەم فەرمودەیە دێنێت: ((ادخل الله الجنة رجلا كان سهلا مشترياً وبائعاً وقاضياً ومقتضياً الجنة))[4]. خوای میهرەبان ئەو مرۆڤەیەی بردە بەهەشتەوە کە هەردەم بە جوامێرانە و مرۆڤ دۆستانە شتومەکی دەکڕیی و، دەیفرۆشت و، دەیدایە قەرز بەم و بەودا، وەری دەگرتەوە. بەڵێ.. ئەم چەند فەرموودەیەو، بگرە چەندین فەرموودەی دیکە ئینسانەکان دنە دنە دەدەن بۆ پیاوەتیی و کاری مەردانەو لێبوردن لە مامەڵەداو، داواش دەکەن کە هەمیشە (ئەخلاق)ـە بەرزەکان ڕەچاو بکرێن و، ڕەفتارو گوفتاری توندوتیژو شەڕە قسەو چەلەحانێ و، قسە لە یەکتر گیران و، یەکتر تەنگە تاوکردن وە گۆڕ نرێن. بێگومان مەردیی و نامەردیی مرۆڤ لە کاتی مامەڵە کردندا دەر دەکەوێت، هەر وەك دنیا ویستی و، خۆ ویستیی و، مادده ویستی هەر لە مامەڵەدا دەر دەکەوێت، بەتایبەتی ئەو

---

(١) أخرجه: البخارى (فتح البارى/كتاب البيوع) (٢٠٧٦/١٦).

(٢) أخرجه: الترمذي (١٣٢٠). صححه الالباني في سنن الترمذي ١٣٢٠.

(٣) أخرجه: الترمذي (١٣١٩). صححه الالباني في سنن الترمذي ١٣١٩ .

(٤) أخرجه: النسائي (٤٦٩٦) . حسنه الالباني في سنن النسائي ٤٦٩٦.

دەمەی کە شتێك دەکڕێت و، خێرێکی تێدا بەدی دەکا، بەڵام فرۆشیارەکە لەبەر هەر هۆیەك بێت حەز دەکا کڕیارەکە (بەیعە)کەی بۆ هەڵوەشێنێتەوە، چونکە لەوانەیە بوو بێتە کێشەو هەرای ناو خێزانەکە.

موسوڵمانی پێشوو واپێگەیەنرابوون کە: هەرکامێك لە فرۆشیار و کڕیار پەشیمان بووبان لە مامەڵەکە، خێرا ئەو لایەنەکەی تر بۆی هەڵدەوەشاندەوە و نەیاندەکردە کێشەو نائاسوودەیی چەند خێزانێك، چونکە زۆر مەبەستی بوو بەر ئەو رەحمەتە بکەوێت کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی ناردووە، ئەگەر کاری ئاوا بکا، بۆیە لەناو ئەو کۆمەڵگایانەدا کێشەو ناکۆکی زۆر کەم بوو، وە بگرە هەمیشە برای یەکبوون، هیوادارم لەم سەردەمەشدا هەر وەکو کۆمەڵی یەکەم رەفتار بکەن، ئەگینە کێشەو هەرایەکی زۆری لێدەوەشێتەوە.. لەوانەیە بگاتە یەکتر کوشتن و، سووکایەتی کردن بەیەکتر، بەتایبەتی ئێستا کە بۆشایی سوڵتەو دەسەلاتی شەرعی هەیەو، دینی خواش داوەر نییە.!



# قەرزاری نەدار دەبێ مۆڵەت بدرێت

(ئەبو هورەیرە) (ﷺ) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەڵێت: ((كان تاجر يداين الناس، فإذا رأى معسراً قال لفتيانه : تجاوزوا عنه لعل الله أن يتجاوز عنا، فتجاوز الله عنه))[٥]. واتە: لەسەردەمی زوودا بازرگانێك هەبوو و لەگەڵ خەڵكییدا مامەڵەی دەكردو قەرزیان دەكەوتە لای، ئەوسا كە نەدارێكی دەدیت بەدەفتەردارەكەی دەگوت: حەزدەكەم لێیان ببوورین، بەشكوم خوای گەورەیش لە ئێمە ببورێ، ئیتر خوای كارجوانیش بوورا لێیان و چاوپۆشی لێكردن.

پێشەوا (موسلیم)یش ئەم فەرموودەیە دێنێت: ((من أنظر معسرا، أو وضع له أظله الله في ظله..))[٦]. واتە: هەركەسێك نەدار تەنگەتاو نەكاو، مۆڵەتی بداتێ هەتا خوا دەروویەكی خێری لێدەكاتەوە..، وە یان گەردنی ئازاد بكات لە قەرزەكە – لە هەمووی، یان لە بڕێكی– ئەوا خوای بالاّ دەستیش دەیباتە بن سێبەری عەرشی خۆیەوەو لە پلە نارەحەتەكانی قیامەت رزگاری دەبێت. وە لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە: ((من سره أن ينجيه الله من كرب يوم القيامة فلينفس عن معسر أو يضع عنه))[٧]. واتە: ئەوی حەز دەكات خوا لە پلە سەختەكانی ڕۆژی قیامەت ڕزگاری بكات، دەبێ هەناسەیەكی خۆشی بە مرۆڤی نەدار بدات، وەیان لەسەر شانی قەرزەكە لاببات و ئازادی بكا، ئایەتی: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ٢٨٠). ئەگەر چی لەبارەی قەرزی سوود هاتووە، بەلاّم (ئیبن جەریری) تەبەری دەڵێت: ئەو جۆرە قەرزانەو گشت جۆرە قەرزێكی تریش وەبەر دەكەوێ، چونكە ئایەتەكە داوای مۆڵەتدان دەكات بۆ قەرزاربوو، دەسا بێگومان ئەم جۆرە قەرزانەیش بەر دەكەون، كەوابوو هەركە قەرزارێك نەدار بوو، واجیبە ماوەی بدرێتێ هەتا ڕۆژێ دەرووی لێدەكرێتەوە، وە نابێ بە هیچ شێوەیەك ئازار بدرێت، وە یان زیندانی بكرێت.



(٥) أخرجه: البخاري (فتح البارى/ كتاب البيوع) (١٨ /٢٠٧٨).

(٦) أخرجه: مسلم (٧٧٠٤).

(٧) أخرجه: مسلم (٤٠٨٣).

## پیاوی بە دەهندەو داراییش مۆڵەت دەدرێت

حوزەیفە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((تلقت الملائكة روح رجل مِمَن كان قبلكم، فقالوا: أعملت من الخير شيئا ؟ قال:كنت آمر فتياني ان ينظروا و يتجاوزوا عن الموسر، قال: فتجاوزوا عنه))[٨]. واتە: فریشتەكان پێشوازیان لە ڕۆحی پیاوێك – كە بەر لە ئێوە بوبوو – كردو لێیان پرسی: ئاخۆ تۆ هیچ كارێكی باشت كردووە؟ گوتی: من هەمیشە بە هاوڕێ و دەفتەردارەكانی خۆمم دەگوت: تەنانەت چاوپۆشی لە خەڵكانی دەوڵەمەندیش بكەن بۆ وەرگرتنەوەی قەرز تەنگەتاویان مەكەن، دیارە بە گوێیان كردم و دەبووران لێیان، وائەمرۆیش فریشتەكان لێمان بووران .

مرۆڤی دەوڵەمەندو دارا ئەوكەسەیە: پێویستی خۆیی و ماڵ و منداڵی هەبێت، هەندێ لەزاناكان دەڵێن: دەوڵەمەندیی و نەداریی بە پێی باوی پەسەندی خەڵكانی ژێری ناوچەكەیە، ئەم فەرموودەیە ئەوەمان پێ دەڵێت: كە سەماحەت و لێبوردن هەمیشە پیشەی موسڵمانانە، بەڵێ.. دەبێ لەگەڵ گشت كۆمەڵگەدا رێك و چاك و دڵسۆزبین و، چاوپۆشیمان هەبێ و بەجوامێرانەو پیاوانە ڕەفتار بكەین.



(٨) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب البيوع) (١٧/ ٢٠٧٧).

## فرۆشتن بە قەرز

جابر (ﷺ) دەڵێ: لە غەزایەکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((وشترەکەت چۆن دەبینی..؟ دەتەوێ بیفرۆشیت..؟ گوتم: بەڵێ دەیفرۆشم، ئەویش لێمی کڕی، بەڵام پارەکەی ئامادە نەبوو، پاشان گەراینەوە مەدینەو پارەکەی دامێ))(٩).

خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت:((ان النبي (ﷺ) اشترى طعاما من يهودي الى أجل و رهنه درعا من حديد))(١٠). واتە: پێغەمبەر (ﷺ) برێ خواردەمەنی لە جولەکەیەك کڕیی و (پارەکەی ئامادە نەبوو) و ماوەیەکی بۆ دیاریکرد – پارەکەی بداتێ – بەڵام بۆ دڵنیایی جولەکەکە کڵاو خوودە ئاسنینەکەی کردە بارمتەو دایە لای. ئەم فەرموودانە مانایان ئەوەیە کە کڕین و فرۆشتن و مامەڵە بە قەرز لە ژیانی مرۆڤدا هەر ڕو دەدا، ئەگەر چی ئەو مرۆڤە پلەو پایە داریش بێت، چونکە دەکرێ مرۆڤ –ئەگەرچی دەوڵەمەندیش بێت – ڕۆژێ هەر نەبوو نەدارا بێت، بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) لەبەر ڕێخستنی ژیان و ژیواری ئەو قەرزو فەرزەیە دەکا، بەڵام دەبێ مافی خاوەن پارەکە ڕەچاو بکرێ و، لەکاتی خۆیدا بدرێتەوەو، هەر ئێستاش دڵنیابێ کە سبەی ڕۆژ نافەوتێ و دەستی دەکەوێتەوە، چونکە ئەو (ڕەهن)و بارمتەیە بۆ ئەوەیە کە ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبوو بیداتەوە...،

وەیان ویستی دوای بخات و نەیداتەوە (داوەر) دەیفرۆشێ و ڕێژەی قەرزەکەی ئەوی لێدەداتەوە، ئەوە پێغەمبەریش (ﷺ) کە کەسیش گومانی لە ڕاستیدا نییە کڵاو خوودەکەی دەخاتە ڕەهنی جولەکەکەوەو لە باتی بەهای خواردنەکەوە !.



(٩) أخرجه: البخاري (فتح البارى/ كتاب الإستقراض) (٢٣٨٥/١).
(١٠) أخرجه: البخارى (فتح البارى/ كتاب الاستقراض) (٢٣٨٦/١).

## نیهادت پاک بێت خوا قەرزەکەت بۆ دەبژێرێت

پێغەمبەری سەروەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((من اخذ أموال الناس يريد أداءها أدى الله عنه، ومن اخذ يريد إتلافها أتلفه الله))[١١]. واتە: هەرکەسێك ماڵی مەردم قەرز دەکاو دەیەوێ — هەرکە بووی — بیداتەوە، یان دەزانێ دەتوانێ بیداتەوە، ئەوا خوای گەورە بۆی قەرەبوو دەکاتەوەو دەرگایەکی خێری بۆ واڵا دەکا کە بیبژێرێت، خۆ ئەگەر بەو نیەتە پاکەوە قەرزەکەی هێناو، پاشان نەیبوو بیداتەوە، ئەوا لە رۆژی قیامەتدا تۆڵە نادرێ و خوای گەورە هەردوو لاشیان رازی دەکات، بەلاّم ئەو کەسەی قەرز دەکاو نیەتی ئەوەیە کە بیخواو نەیداتەوە، ئەوە خوای گەورە هەر لە دونیادا فەڕو پیت لە ماڵ و سامانی هەڵدەگرێ و کەم نرخی دەکات لای خەڵکان.

ئەبو زەڕ دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بە کێوی ئوحودی فەرموو: ((ما احب انه تحول لي ذهبا يمكث عندي منه دينار فوق ثلاث إلا دينارا ارصده لدين))[١٢].

واتە: پێم خۆش نیە ئەو چیایەی ئوحود ببێتە زێڕو پتر لە سێ رۆژ لام بێت، ئەگەر ئەو دینارەی بۆ بژاردنەوەی قەرزی دابنێم، کەوابوو نیهادەی باشی و خۆ ئامادەکردن بۆ قەرز دانەوە پیشەی مرۆڤ چاك و ساڵحانە، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ (النساء: ٥٨) واتە: خوا فەرمان دەدات کە هەموو سپاردەو ئەمانەتەکان بدەنەوە دەست خاوەنەکانیان، دیارە قەرزیش یەکێکە لە سپاردەکان وەکو (ئیبن عەباس) دەڵێت.



(١١) أخرجه: البخاری (فتح الباری/کتاب الاستقراض)/(٢/٢٣٨٧)

(١٢) أخرجه: البخاری (فتح الباري/کتاب الاستقراض) (٣/٢٣٨٨).

## ئاژەڵ و پاتاڵیش قەرز دەکرێت

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) وشترێکی لە پیاوێك قەرز کرد. ئینجا لەمەوە زاناو فەقیهەکان دەڵێن: کەوابوو قەرزکردنی هەموو جۆرە ئاژەڵ و پاتاڵێك ڕەوایە، بەڵام کە خاوەنەکەی هاتەوە بۆی، بەشێوەیەکی توندو ناجوامێرانە داوای کرد، بۆیە هاوەڵان تووڕە دەبن و دەیانەوێ ئازاری بدەن لەسەر ئەو بێ ئوسلوبیی و نا جوامێرانەیەی، کەچی پێغەمبەر لێ نەگەڕا ئازاری بدەن و فەرموویشی: ((دعوه فان لصاحب الحق مقالا)) [13] وازی لێبێنن با قسە بکات، چونکە هەقدار حەقیەتی قسە بکات، دەسا هەر ئێستا بچن و وشترێکی وەك ئەوەی خۆی بۆ بکڕنەوە، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! وشتری لەو جۆرو تەمەن و ساڵە دەست ناکەوێ واتە: چاکتر لەوەی خۆی هەیە، فەرمووی: دە بچن بۆی بکڕن: ((فان خیرکم أحسنکم قضاء))[14]. چونکە باشترینتان ئەو کەسەیە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك قەرز بداتەوەو چاکتر لەوە قەرزی کردووە بنێرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، کەوابوو خاوەن قەرز دەتوانێ — هەرکە وەختی وەرگرتنەوەی قەرزەکە هات — داوای قەرزەکەی بکات، بەڵام ڕیعایەتی ئەدەب و وێڵ بکات، ئەگەر حەیاو ئەدەب و وێڵی پێغەمبەر (ﷺ) نەبووبا لەوانەبوو ئەو کابرا قسە ڕەقە ئازار بدرایە.



١٣ صحيح البخاري –كتاب الوكالة، باب الوكالة في قضاء الديون – حديث : ٢٢٠٤

(١٤) أخرجه: البخارى (فتح البارى/كتاب الاستقراض) (٤ /٢٣٩٠)

## خاوەن قەرز دەتوانێ گشت قەرزەکەی داوا بکا، دەشتوانێت دەستی لێهەڵبگرێت

جابر (ﷺ) دەڵێ: لە ڕۆژی (ئوحود)دا عەبدوڵلاَی باوکم شەهید بوو و قەرزاێکی زۆر بوو، خاوەن قەرزەکانیش بە پەلەو سەختگیرانە داوایان لێدەکردن! منیش پەنام بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ چارەسەر، ئەویش داوای لێکردن کە: بەرو دەرامەتی ئەو ساڵەی باخە خورماکەمان لە باتی قەرزەکەیان وەربگرن و باوکم ئازاد بکەن، بەلاّم خاوەن قەرزەکان قەناعەتیان نەکرد، ویستیان باخە خورماکە بەرن! پێغەمبەریش (ﷺ) نەیداو فەرمووی بە من: سبەینێ دەگەڕێمەوە لاتان، پاشان کە ڕۆژبویەوەو تەشریفیان هاتەوەو بەناو باخەکەدا ئەم سەرو ئەوسەرێکی کردو داوای لە خودا کرد: بەرەکەت بخاتە ئەو باخەوە، تا قەرزی ئەو شەهیدەی پێ بداتەوە، پاشان جابیر دەڵێ: مۆڵەتی دام بە لێکردنەوەو چنینی خورماکە هەتا ئەوەندەم لێ چنی گشت قەرزەکانم پێ بژاردو هێشتا بۆشمان مایەوە!.

**خوێنەری هێژا:** ئەمانە باسکران چەمکێك بوون لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی ماوەدان و مۆڵەتدانی خاوەنقەرزەکە بە قەرزارەکان، وەیان گەردنیان ئازاد بکا...

بەلاّم بۆ پراکتیکی ئەمانە پێویستە:

١ـ هێزی ئیمان و باوەڕ زاڵببێت بەسەر دڵ و دەروونیدا، ئیمان مرۆڤ داچڵەکێنێت و تەماحی ئەو موژدە گەورەیە بخاتە بەر دەستی کە: هەر کەسێك ماوە بدات بە کەسانی هەژارو نەدارو دەسکورت لە داواکردنەوەی قەرزدا، خوای گەورە لەرۆژە سەختەکانی قیامەتدا دێت بە هانایەوەو دڵی خۆش دەکات، هەر وەکو ئەو لەو تەنگانەیەدا دڵی ئەو موسڵمانانی خۆشکردووە.

٢ـ مرۆڤی موسوڵمان ـ هەر وەکو ئیسلام هەڵیدەنێ بۆ بازرگانیی و گەشت و گەڕ ـ هەر وایش هەڵی دەنێ ئەوەندە نەچێت بە دەم ماددەو دنیاوە، ئەگینە لە پلەی شیاوی خۆی

ڕێزی بەرزی دێتەوە خوارێ و، زۆر جارانیش تووشی قەرزو فەرز دەبێ، نابینی کاتی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینەدا وتاری هەینی دەخوێندەوە بۆ موسڵمانان — دیارە هێمان سەرەتای ئیسلامەو ئەو خەڵکەیە لە کاری جاهیلییەت بە تەواوی وازی نەهێناوە — بۆیە هەرکە بیستییان کاروانەکە — کە چوبووە دەرەوەی وڵات — وا گەڕایەوە بە تەپڵ و دەف و هەراوە، ئەمانیش وتارەکەیان بە جێهێشت، تەنیا (١٢) کەسیان مانەوە بۆ وتارەکەو نوێژی هەینیی، ئەوسا بۆ قێزەونکردنی ئەو کارو ڕەفتارە لای موسڵمانان ئەم ئایەتەی: ﴿ وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًاۚ قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾ (الجمعة: ١١) هاتە خوارێ و، بە زەقی جۆرە ئیهانەیەکی تێدایە بۆ ئەوانەی هەردەم کەوتوونەتە دوای (ماددە)و دنیاو هەڵپەیانە، جابیر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ((عن جابر (رضي الله عنه) قال: "أقبلت عير ونحن نصلى مع النبـي ﷺ الجمعة، فانفض الناس الا اثنـي عشر رجلا، فنزلت هذه الاية: (واذا رأوا تجارة أو لهوا انفضوا إليها وتركوك قائما))".[١٥]

مرۆڤی کاڵ و کرچ ئاوا بازرگانیی و خۆشەویستی دونیا چەواشەی دەکا، بەڵام مەردی جوامێرو چاك ئاکار ئەگەرچی بازرگان و کاسبکار بێت، هەرگیز لە بەرامبەر هیچ فەرمانێکی خوای گەورەدا یاخی نابێ و پاشەکشێ ناکات وەکو ئەم ئایەتەی (٣٧)ی سوورەتی (نوور) دەفەرموێ: ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ .... ﴾ (النور: ٣٧) دوپاتی ئەو ڕاستییە دەکاتەوە.

٣- مافی خزمایەتی بپارێزێ و ڕێز لە ئینسانەکان بگیردرێ و، پەیوەندیی و دۆستایەتیی ئەم و ئەو ڕەچاو بکرێت، نەك بۆ شتێکی کەمی بێ بایەخ گوێ بە هیچ پەیوەندییەك نەدات!.

٤- چەند دانووستن و مەجلیسێکی بۆ بگیردرێت، بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەی پێشهاتووە، لەو مەجلیسەدا داوا لە خاوەنقەرزەکە بکرێت، هەر هیچ نەبێت دەست لە بڕێکی هەڵبگرێت،

(١٥) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب البيوع) (٢٠٦٤/١١).

وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بۆ قەرزەکانی (عبدالله)ی باوکی (جابر) "خوا لێی رازی بێت" کە لە (ئوحود)دا شەهید کرابوو، خاوەن قەرزەکانی بانگکردو تکای لێکردن کە لە هەندێکی ئازادی بکەن، دیاریشە کە ئەگەر ئەو قەرزارە نەبوو و نەداربوو، شەریعەتی ئیسلام ناچیٚ هەڵیواسێت و بیکاتە پارە، بەڵکو مۆڵەتی دەداتیٚ و بەرنامەیەکی هەیە بۆ ئەو جۆرە کارە پێشهاتانە، ئەم قەرزاریی و تێشکانە – دەکرێت – لە هەموو کەسێك ڕووبدات، ئەمڕۆ تۆو، سبەینیٚ ئەو، کەوابوو دەبیٚ کۆمەڵگە زۆر بە جوامێرانە ڕێزو حورمەت لە یەکتر بگرن و لە هەمووکاتێکدا هاوکاریی و هەماهەنگی یەکدی بکەن، ئەگینە هەژار تووشی دەیان کاری نارەواو ناپەسەند دەبێت، هەر لە قەرزو ریباو سوو خواردنەوە، هەتا خۆ فرێدانە باوەشی ئەم و ئەو، دەرەنجام کۆمەڵگەیەکی دژ بە یەکترو پڕ لە خەشم و قین بەرامبەر بە یەکتر درووست دەبێت!.



## دەبێ قەرزارەکەیش دیندارو بە ویژدان بێت

بەڵێ.. تا ئێرە باسی سەماحەت و جوامێریی و مەردی خاوەنقەرزەکەمان کرد، ئێستایش کورتە باسێك لە قەرزارەکە دەکەین کە ئەمیش دەبێ زۆر بە ویژدان و دیندارو گوێرایەڵیی (إرشادات)و ڕانماییەکانی پێغەمبەر بێت (ﷺ) بۆ نموونە کە دەفەرموێ: ((مَطْلُ الغني ظلم))[١٦]. واتە: درێژ کردنەوەی ماوەی قەرزو، دوا خستنی لە کاتی دیاریکراودا، لەلایەن خەڵکانی داراو دەسەڵاتدارەوە کارێکی ستەم و ناهەقەو بە ستەمکار دەدرێنە قەڵەم، کەوابوو ئەگەر لە دەستییا شتێك هەبوو با خێرا بیداتەوە تا ئەویش کەڵکی لێوەربگرێتەوەو، جارێکی تریش بوێریێ پیاوەتیی و هاوکاری ئاوا بکا. وە یان لەم فەرموودەیەدا هاتووە: ((ليي الواجد يحل عقوبته وعرضه))[١٧]. واتە : ئەمڕۆو سبەینێی دەوڵەمەندو دارا لە دانەوەی قەرزی ئەم و ئەودا، ڕێگە بۆ خاوەنقەرزەکە خۆشدەکا: نێوی بەخراپە بەرێ و بیشیخاتە بەندیخانەوەو سزا بدرێت. واتە: پاش ئەوە کاتی دانەوەی قەرزەکە هات و، دەیشیتوانی بیداتەوە، بەڵام هەر پێچی دەدا لە خۆیی و لاساری دەکرد، ناهەقی مەگرە لە خاوەنقەرزەکە لەملاو لەولا ناوی بەرێ، وە یان بیداتە دادگاو سزای بدرێت.

**خوێنەری هێژاو بەڕێز !** دەسگرتن بەسەرو ماڵی مەردمداو زەوتکردنی – بە هەر ناوێکەوە هەبێت – لە دینی ئیسلامدا دراوەتە دواوەو (رفض) کراوە، تەنانەتی پێغەمبەرمان (ﷺ) لە سەرەتاوە نوێژی لەسەر مردووی قەرزار نەدەکرد، پاشان کە (بيت المال) دەوڵەمەند بوو و قەرزی قەرزارەکانی " لەبەر میهرەبانی خۆی" لە ئەستۆ دەگرت، ئەوسا نوێژی لەسەر دەکردو فەرموویشی: ((من ترك مالا فلورثته، ومن ترك كلا فإلينا))[١٨].

(١٦) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب الاستقراض) (١٢ / ٢٤٠٠).
(١٧) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب الاستقراض) (١٣ / ٢٤٠٠).
(١٨) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب الاستقراض) (١١ / ٢٣٩٨).

هەر کەسێك مردوو، ماڵ و سامانی لێ بەجێ ما، بۆ خزمانی میراتبەری خۆی دەبێت، ئەو کەسەیش کە ماڵ و منداڵێکی هەژارو بێ نەوا بە جێدێڵێت، خۆمان خەمیان دەخۆین. شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام و، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئابەو میهرەبانیی و سۆزەوە سەیری مرۆڤی چاك و پاك و لێقەومان دەکەن، ئەگەر ماڵی بە جێ هێشت بۆ خۆی دەبێت، خۆ ئەگەر بە قەرزاری سەری نایەوە بۆی دەبژێردرێ، بەتایبەتی ئەوانەی لە ڕێگای چاکسازیی و خێرو خێرات و منداڵ بەخێوکردندا قەرزاربوون، ئاخۆ دڵسۆزێکی تری ئادەمیزاد وەکو ئەو پێغەمبەرە هەبوو بێت؟! ئاخۆ پێشەوایەکی تر ئاوا دەچێتە ژێر قەرزی قەرزاران؟.

لەولایشەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە خۆیانەوە، بێ پێویست، بێ جێ، قەرز نەکەن، هەمیشە لە نوێژەکاندا لە خوا دەپارایەوە قەرزار نەبێت و چاو لەبەری ئەم و ئەو نەبێت: ((**اللهم إني أعوذ بك من المأثم والمغرم**))،[19] بۆیە پیاوێکی ژیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! قەرزاری ئەوەندەی دەوێت کە: تۆ ئەوەندە بپارێیتەوە لە خودا قەرزار نەبیت..؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ((**إن الرجل إذا غرم، حدث فكذب، و وعد فأخلف**))[20]. بەڵێ دەیەوێت، چونکە ئینسان کە قەرزاربوو تووشی درۆ دەبێت، وە بەڵێن دەدات، ڕاست ناکات و بە پێچەوانەوە دەجوڵێتەوە، دیارە ئەو جۆرە ڕەفتارانە هی پیاوی (منافیق)و دوو ڕوویە.

**خوشک و برایانی بەڕێز !** ئەم چەند فەرموودەیە باقەیەك بوون لە خەرمانی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کێشەو گیرو گرفتەکانی (قەرز)کردن و چارەسەر بۆیان، هیوادارم گشتمان سوودی لێوەرگرین لە ژیانمانداو، سەرجەم ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەچاو بکەین، بە تایبەتی هەوڵبدەین کە قەرزێك زۆر پێویست نەبێت نەیکەین، هەتا ڕوو زەردی ئەم و ئەو نەبین و، لە قیامەتیشدا مجرۆ نەبین، ئیسلام دەرگای قەرزی دا نەخستووە، بەڵکو یاساو ڕێنمایی بۆ دیاریکردووە، مرۆڤەکان هەڵدەنێت بە سەدان ئایەت

(١٩) صحيح البخاري- كتاب الأذان، أبواب صفة الصلاة - باب الدعاء قبل السلام ، حديث : ٨١٠
(٢٠) أخرجه: البخارى (فتح البارى/ كتاب الاستقراض) (١٠/ ٢٣٩٧).

و فەرمووده کە لە کاتی پێویست و تەنگانەدا دەستی یەکتر بگرن، بەڵام هەتا بکرێت مرۆڤ خۆی قەرزار نەکات، گەلێ کەس بۆ (کمالییات) خۆی دەخاتە ژێر قەرزێکی زۆرەوە، بێ ئەمە جێگەی ببێ و، بتوانێ لە کاتی خۆیدا بیداتەوە، لە ئەنجامدا "کاتی دانەوەی" ناچار دەبێت درۆو دەلەسەیەکی زۆر بکا. بەڵێ قەرزێك لەبەر ناچاریی بێت، وەیان بۆ سوڵح و ئاشتەوایی نێوان دوو کەس، یان دوو هۆزو بنەماڵە بێت، وە یان لە پێناوی زانست و زانیارییدا بێت، وە یان بۆ نەخۆشیی و چارەسەر بێت...هەروەها، ئەوە ئەو جۆرە قەرزانە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ئەستۆی دەگرێ و، (بيت المال) بۆی دەبژێرێت، هەر ئەمەیشە کە ئایەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة: ٦٠) بەشێك بۆ قەرزارەکان دیاریی دەکات.

لە کۆتاییدا داواکارین لە خوای گەورە لە قەرزاریی وە دوورمان بگرێت و، هەمیشەیش ئەم زیکرەیە بخاتە سەر زارمان، هەتا پەنا لە خۆی بگرین لە قەرزاریی: ((**اللهم اكفني بحلالك عن حرامك، وأغنني بفضلك عمن سواك**))[٢١].

**١٧ ی ربيع الثاني ١٤٢٤ ك**
**١٧ ی حوزەیرانی ٢٠٠٣ ز**
**هەڵەبجەی شەهیدان**



(٢١) أخرجه: الترمذي (٣٥٦٣). حسنه الالباني في سنن الترمذي ٣٥٦٣.

# ٢- زەویی و لەوەڕگەو ئاوە خۆرەی گوند نشینەکان

## دەسپێک:

ئێمەی ئیماندارو خاوەن باوەڕ، باوەڕمان وایە کە ئەم شەریعەتەمان، چارەسەرو دەرمانی هەموو رووداوەکانی تێدایە، ئەمەش یان هەر لەدەقی ئایەت و فەرموودەکانەوە – یەکێکیان یان هەر دووکیان – دیارە لەبەر رووناکی ئەواندا زاناکان چارەسەری بۆ دادەنێن، پاشان ئێمەیش دەبێ تاڵە موویەك لێیان کلا نەبین، ئەمەیە کەخوا بە پێغەمبەرو ئوممەتەکەی دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ (النساء: ٦٥). وە دەفەرموێت : ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴾ (الأحزاب: ٣٦). مەبەست لە هەردوو ئایەتەکە ئەوەیە کە: مرۆڤ هەرچەند خۆی بەخاوەن ئیمان و دیندار بزانێت، دەبێ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە تێرو تەواوی شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت بێت، ئەگینا ئیمانی دانەمەزراوەو کاڵ و کرچە – ئەگەر لە دین دەر نەچێت – وە لە هەموو کێشە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەکاندا، دەبێ لە ئیسلامدا چارەیان بۆ بدۆزنەوە..، نەك دابەشیان بکەن: هەرچی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە، وەکو باری کەسێتیی: (الأحوال الشخصية) و مەسەلەی دەسنوێژو بەچی دەشکێ، ببرێنەوە بۆ مزگەوت، هەرچیش کێشە سیاسییەکانە – لەتەشکیلەو پەیکەری دەوڵەت– ببرێنە کۆشکی سپیی و کرملین !! بۆیە بۆ دواتریش خوای گەورە بەر لە کۆچی دوایی پێغەمبەر ئەو مەبەستە دوپات دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ﴾(المائدة: ٣). 

واتە: لە ئەمڕۆوە دینەکەتانم بۆ تەواو کردن: هەم لە رووی ئاقیدەوە، هەم لە رووی پەیام ودەستوورەوە، واتە: ئیتر پێویستان بە هیچ شتێکی تر نییە، هەر لەم سونگەوەیە کە ئێمە

هەمیشه دەڵێین هەرکەسێك بەلایەوە وابێ ئەم دینی ئیسلامە کەم و کورتییەکی تێدایە، ئەوە لەدین لایداوەو پێچەوانەی دەقی ئایەتەکان جووڵاوەتەوە. ئێمەش لەم زنجیرەیەدا —کێشه کۆمەڵاتییەکان وچارەسەریان لە ئیسلامدا — کێشەیەکی بنەرەتیی و حاشا هەڵ نەگر (زەویی و لەوەڕگەی گوند نشینەکان) چارەسەرێکی شەرعییانەی بۆ دەنووسین، چونکە ئەو جۆرە کێشانە گەلێ جار دەبنە هۆی بچڕانی پەیوەندییەکانی نێو کۆمەڵگەی کوردەواری، بە تایبەتی گوندنشینەکانمان، لەناو خۆیاندا، یان ئەمگوند لەگەڵ ئەو گوندەکەی تردا، دیارە کە هەموو گوندێك حەدو سنوورێکی بۆ خۆی دیاریکردووە، هەر لە ئاوو مەزراو کشت و کاڵ، تەنانەتی شاخ وچیاکانیش، دارو بەردو گژوگیاو لەوەڕو لەوەڕگە..هتد. گەلێ جاریش هەراو کێشەی لێدەکەوێتەوەو، دەگاتە پیاو کوشتنیش! جا بۆ ئەنجامدانی ئەمکارەش هەر لەخوا داوای یارمەتی دەکەم.



# هەر سوڵتەی شەرعیی دەتوانێ سنوور قۆرخ بکات (لا حِمی إلا للهِ وَ لِرَسولِهِ).

خوای دلۆڤان ئەم هەموو لەوەڕو لەوەڕگەو، میوەو سەوزەو گژوگیاو سێبەرو سەهەنگ و چۆم و کانیاوانەی ﴿مَتَٰعًا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾ (النازعات:٣٣)، لەبەر ئادەمزادو مەڕو پاتاڵەکەی بەدیهێناوە بۆیە لەگەڵێ جێگای قورئاندا دەیکاتە منەت بەسەرمانەوەو، بە بەڵگەیش دەیهێنێتەوە بۆ قودرەت و توانایی و دەسەڵاتی خۆی لەم بوونەوەرە فراوانەدا، وە بۆ زیندوبوونەوەمان – پاش مردن–. جابۆ ئێمەش هەقە ئەوانە هیچیان لەبیر نەکەین و پێبزانین و شوکرانە بژێر بین.

لە ئەساسدا هەقە خۆمان و مەڕو ماڵاتمان بە ئازادانەو بێ سنوور لەم جیهانەدا، ژیان بەسەر بەرین و لەو هەموو نیعمەتانە سوود وەرگرین، ئەوکاتانە نەبێ بگاتە زیانگەیاندن بە خۆمان، یان بە خەڵکانی دەورو بەرمان، ئەوکات بە ناچاریش بێت سنوور دادەنرێت بۆ ژیان و سوود وەرگرتن لـــەو نـــازو نیـعمەتـــانەی خوا بەخشیـونـی بە ئادەمزاد، تا زێدە ڕۆیی نەکرێ و مافی یەکتر پێشێل نەکەین، ئەو سنوورەش هەردەبێ خوا، یان پێغەمبەرەکەی – کە بریکارە بۆ پیادەکردنی فەرمانی خوا – دیاریی بکات، واتە: کەسێك لە کەسێکی تر – بەدەر لە خوا – بە دەسەلأت تر نیەو خاوەنی ئەم بوونەوەرە نیە..

بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێت : ((لا حمى إلا لله ولرسوله))[٢٢]. واتە: هەر خواو پێغەمبەر مافی سنوور دیاریکردن و قۆرخکردنیان هەیە، دەتوانن جێگایەك دیاری بکەن بۆ حەوانەوەو لەوەڕگەی مەڕو ماڵات و زەویی بۆ کشت و کاڵ.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: پاش پێغەمبەریش ئەو دەسەلأتە – تەنانەتی – بە خەلیفەکانیش نادرێ و هەر لە پێغەمبەر خۆی قۆرخە، بێگومان ئەم رایە زۆر بە هێز نیە،

(٢٢) أخرجه: البخاري (فتح الباری/كتاب المساقاة) (١١/ ٢٣٧٠).

چونكە خەلیفەكان جێنشین و جێگەداری ئەون و، دەبێ بتوانن ئاڵ و گۆڕو بڕیار لە پێشهاتەكاندا بدەن، بۆیە عومەر (ﷺ) لەسەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا هەڵسا بە قۆرخكردنی ئەم دوو شوێنە: (شەرەف) و (رەبزە) بۆ لەوەڕی وشترو وڵاخی هاوەڵانی جیهادكار.

پێشەوا شافعیی (رحمه الله) دەڵێ: پاش پێغەمبەر تەنیا خەلیفەكان دەتوانن ئەو كارە بكەن و رێ و شوێنێ لە مەردم قەدەغە بكەن و نەهێڵن بە شێوەیەكی گشتی سوود لە چۆم و لەوەڕگەكەی وەر بگیردرێ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ بەو قۆرخ و دابڕینە زیان بە هاولاتیانی تر بگات، بۆ بەڵگەی ئەم رایە لە (بوخاری)یدا بە ژمارە: (٢٣٧٠) ئەم فەرموودە هاتووە: ((..بلغنا أن النبـي حمى النَّقِيعَ، وأن عمرَ حمى الشَّرَفَ والرَّبَذَةَ))[٢٣].

لە سەر دەمی جاهیلیەتدا سەرۆك خێڵێك بە خۆیی و مەڕو ماڵاتەكەیەوە دەچوویە جێگایەك بۆ لەوەڕخۆری، ئەوسا چەندە دەنگی سەگ وەڕەكەی رۆیشتبا قۆرخی دەكرد لە خەڵك و نەیدەهێشت كەسێكی تر نزیك بكەوێتەوە، لەولایشەوە دەسەڵاتدارێكی تر هەروا ! تا وای لێدەهات گەلێ لە ئاژەڵدارەكان رێ و شوێنیان بۆ نەدەمایەوەو، لەوەوە گەلێ هەراو كێشەی لێدەكەوتەوە، جا كە ئیسلام هات و دەسەڵاتی پەیدا كرد، ئەو بێ سەرو بەریەی نەهێشت و یاسایەكی بۆ داناو پێغەمبەرو خەلیفەكان رێكیانخست، ئەوەبوو ئەوانیش هەمیشە لە رێكخستنی كاروباری ئەو كۆمەڵگەیەدا بوون، پاش ئەوانیش وەك یاسایەك بۆ ئێمە مایەوە تاقیامەت، شیاوی ئاماژە پێكردنە ئەو قۆرخ و دابڕینە هیچی بۆ خۆیان نەبوو، واتە: وەكو ئێستا نەبوو هەموو بەرپرس و دەسەڵاتدارەكان هەڵسن هەر پارچە زەویەك باش و بەكەڵك بێت دایبڕن بۆ خۆیان و كەسیش بۆی نەبێ فزە بكات، بەتایبەتی ئەگەر لەناو كەوانەكەدا نەبیت! ئیسلام هات بڕیاریدا: سەرجەم ئەوخەڵكە هەقیانە لەو زەویی و زارو لەوەڕو لەوەڕگەیە سوودمەند ببن بێ دانانی هیچ سانسۆرێك.

---

(٢٣) الراوي : الصعب بن جثامة، المحدث: البخاري، المصدر:صحيح البخاري، الرقم: ٢٣٧٠.

تێبینی: ئیسلام ددان دەنێ بە خاوەندارێتی تاکیدا (الملكية الفردية) بەمەرجێ زیان بە هاولاتیان نەگات و لەژێر چاودێری سوڵتەی شەرعیدا بێت، لە کتێبە فیقهییەکاندا ئەو دابەشکردنی زەویی و زارە پێیدەڵێن: (إحياء الموات) واتە: بەگەڕ خستنی ئەو زەویی و زارە کە تا ئەو سات و کاتەی ئەو کەسە دەیەوێ ئاوەدانی بکاتەوە — بە بینا، یان بە کشتوکاڵ — هیچ کەسێکی تر ئاوەدانی نەکردبێتەوە، دیارە هەر ئیش و کارێك لەو جۆرە زەویانەدا بکرێت، بەر چاو دەگیردرێ و حیساب بۆ کابرای زەحمەتکێش دەکرێ، واتە: بەو ئیش و کارەیەی دەبێتە خاوەنیی و کەسێك بۆی نیە لە دەستی بسێنێت، ئەگەر دەوڵەتیش بێت، مەگەر زیان بە خەڵکانی تر بگەیەنێت، ئەویش دەبێ بە پێی پێویست قەرەبوو بکرێتەوە بۆی.



## خاوەندارێتی تاکی بەچی دەچەسپێت ؟

**پێغەمبەرمان ((موحەمەد – ﷺ)) دەفەرموێت: ((من أعمر أرضا ليست لأحد فهو أحق))[٢٤].**

**واتە: هەر کەسێك زەوییەکی ئاوەدانکردەوەو هی کەسیش نەبوو، خۆی لە هەموو کەسێك لە پێش ترە پێی. ئەو کەسە هەڵدەسێت بە ئاوەدانکردنەوەی پارچەیە زەویی، بەردی لێ دوور بخاتەوەو رێك و پێکی بکات، جۆگەی ئاوی بۆ ببات، یان بیکات بە خانوو و بینا، یان بە کشت، ئەو کەسە دەبێتە خاوەنی، ئیتر نزیکی ئاوایی بێت، یان نا، سوڵتە مۆڵەتی بە ئاوەدانکردنەوەی دابێ، یان نا، لەم سونگەوەیە دینی ئیسلام رێز لە ئیش و کاری کاریگەر دەگرێ و، دەبێتە خاوەنی رەنجە شانی خۆی، هەتا ئەو کات ببێتە لەمپەر لە بەردەم خەڵکانی تردا، ئەوسا بەرژەوەندی گشتی چۆن داوا بکات، بەو شێوەیە رەفتار دەکرێ.**

**(عەلی کوڕی ئەبو تالیب)یش (ﷺ) دەڵێ: "في أرض الكوفة مواتا" واتە: لە زەویە چۆڵ و وێرانەکانی کووفەدا هەقی ئاوەدانکردنەوە هەیە.**

**(عومەری کوڕی خەتتاب) گوتی: "من أحيا أرضا ميتة فهي له"[٢٥].**

**واتە: زەویی هی ئەو کەسەیە ئاوەدانی دەکاتەوە، نەك بۆ ئەوانە بە ئارەزووی خۆیان، یان بە زۆرو زۆرداریی خۆیان دنیا داگیر دەکەن، وە هەر بە دیاریکردن – بەبێ ئیش تیاکردنی و زەحمەتکێشان تێیدا – نابێتە ماڵی، بەڵکو ئەگەر چەم بوو، دەبێ پاکو خاوێن بکرێتەوە، ئەگەر لم و بەردو زیخ و چەوە، دەبێ وەلا بنرێت، تەنانەتی ئەگەر توانای ئاوەدان کردنەوەی نەبوو، یان نەیتوانی وەکو پێویست بیکاتە کشتوکاڵ، یان بیناو ساختمان، دەبێ لێی وەربگیردرێتەوە، بە بەڵگەی ئەوە کە: (عومەری کوڕی خەتتاب) نامەیەکی نووسی، لەونامەدا هاتبوو: "من عطل أرضا ثلاث سنين لم يعمرها فجاء غيره فعمرها فهى له "[٢٦].**

(٢٤) أخرجه: البخاري (فتح البارى/ كتاب الحرث والمزارعة) (١٥/ ٢٣٣٥).

(٢٥) أخرجه: البخاري (فتح البارى/ باب من أحيا أرضا مواتا).

(٢٦) أخرجه: البخاري (فتح البارى / باب من أحيا أرضا مواتا).

واتە: کەسێك سێ ساڵ زەوییەك لە ژێر رکێفیا بوو و ئاوەدانی نەکردەوە، ئەوسا کەسێکی تر هات ئاوەدانی کردەوە، بەوە دەبێتە ماڵی کەسی دووەم، کەوابوو ئەو کەسانە کە تەنها توانای ئاوەدانکردنەوەی دە دۆنم زەوییان هەیە، کەچی بە پارتی زانی (١٥ — ٢٠) دۆنمیان داگیر کرد! دەبێ زیادەکە بدەنە دواوە هەتا بدرێ بە خێزانێکی ڕەش و رووت و بێ دەرامەت، وەیان گەلێ کەس هەیە چووەتە شارو زەویی و زارەکەی بێ سەرپەرست ماوەتەوەو کەسێك نیە وەبەری بێنێ، جگە لەوەیش دەبێتە مایەی کەمبوونەوەی رێژەی بەشی هەژارو دەسکورتەکان، لە حاڵەتی ئاوادا دەبێ ماوەیان بۆ دیاری بکرێت، یان ئەوەتە بیکەنە کشت و کاڵ و بینا، یان ئەوەتە دەستی لێ بکێشنەوە، چونکە پێویستییەکی گشتییەو نابێ ئاوا بمێنێتەوە، یان هەندێ کەس هەیە کاتی خۆی زەویەکی زۆری بە هەرزان کڕیوەو ئێستا هەر هێشتوویەتەوەو پێویستی پێی نیە، دیسان دەبێ ئاگادار بکرێ، یان بەکاری بێنێ لە پێداویستییەکەیدا، یان دەوڵەت لێی وەر دەگرێتەوە، چونکە هەرکات خاوەندارییەتی تاکی بوویە زیان بۆ کۆمەڵگە، رێزی لێناگیردرێ و لە دەست خاوەنەکەی دادەماڵرێ، خۆ لەو لایشەوە ئەو پارچە زەویانە کە بە بۆشایی لە جێگایەکدا دەمێننەوە، رووی جوانیی و شارستانیەتی شارەکە دەشێوێنن، ئەمەیش پێچەوانەی شارستانیەتە، بێگومان لە کاتی ئاوادا پێویستە سوڵتەی شەرعیی بەرهەڵستیی بکات، بەتایبەتی ئەوکاتە کە دەوڵەمەندەکان، یان دەسەلاتدارانی سوڵتە، زەویی و زارێکی زۆر دادەبڕن بۆ خۆیان و، چینی هەژارو فەقیرو غەیرە حیزبی و وەچەو نەوەی ئاییندە بێ بەشدەکرێن، (عومەری کوڕی خەتتاب) (ﷺ) فەرمووی: ((لولا آخر المسلمين ما فتحت قرية إلا قسمتها بين أهلها كما قسم النبـي (ﷺ) خيبر، ولكني أتركها خزانة لهم يقتسمونها))[٢٧]، واتە: ئەگەر لەبەر نەوەو نەسلی ئاییندە نەبووبا، هەر گوندو ولاتێکم فەتح کردبا، منیش وەك پێغەمبەر (ﷺ) چۆن (خەیبەر)ی دابەشکرد، دابەشم دەکرد بەسەر ئەو خەڵکەدا لەوێ ئامادەن بوون و جیهادیان کردووە، بەلام (عومەر) لەبەر نەوەی ئاییندە هەڵسا ئەسڵەکەی

(٢٧) أخرجه: البخاري (فتح الباري /كتاب الحرث والمزارعة) (١٤/ ٢٣٣٤).

وەقف کردو بەرووبوومەکەی کردە خێرو صەدەقە لەسەر نەوە دوای نەوە. کەواتە پێویستە لەسەر شارەوانیەکان زۆر بە وردیی و رێکوپێك نەخشەو پلان دارێژن بۆ شارەکان، هەتا نەوەی ئاییندە لەو زەویی و زارە بێبەش و مەحرووم نەبن، هەر وەك دەبێ دەوڵەت ئاگای لە زەوییە کشتەکان بێت و، نەهێڵێ بکەونە ژێر چنگی دەسەلاتدارێك بە ئارەزووی خۆی کاریان تیا بکات.

بەڵێ.. سیاسەتی پێغەمبەر (ﷺ) وابوو – چونکە سەرەتای ئیسلام بوو – هەر ناوچەیەکی فەتح کردبا وەکو خەیبەر، زەویی و زارەکەی دابەش دەکرد بەسەر موجاهیدەکاندا، بەنیازی بووژاندنەوەیان و پەیداکردنی گوزەران و دڵخۆشکردنیان، بەلاّم کاتێ (عومەر) (رضي الله عنه) دەوری هات و، ولاّتی (عێراق) و (فارس)ی فەتح کرد – کە ناوچەیەك بوو لە چڕو پڕیی و سەوزو شینی خۆیدا، ناو بانگی بە (سواد العراق) دەرکردبوو – هاوەلاّن داوایان لێکرد دابەشی بکات بەسەریاندا، ئەویش لەبەر چەند بەرژەوەندییەکی شەرعیی کە پێش چاوی گرتبوون – یەکێ لەوانە بێبەش نەبوونی نەوەو نەسلی ئاییندە – دابەشی نەکرد، بەڵکو لە دەستی خاوەنەکەیدا هێشتیەوەو سالاّنەیەکی لەسەر دانا بیدەنە (بيت المال). ئەمەش دەقێك لەو بارەوە لە کتێبی (السياسة الشرعية)ی (شێخ قەرزاویی) ئەویش لە کتێبەکەی (الأموال لأبي عبيد)وە وەریگتووە، دەڵێ: "أن عمر كتب إلى (سعد بن وقاص) يوم افتتح العراق، : أما بعد، فقد بلغني كتابك: أن الناس قد سئلوا أن تقسم بينهم غنائمهم، وما أفاء الله عليهم، فانظر ما أجلبوا عليك في العسكر، من كراع أو مال (يعني من الأموال المنقولة) فأقسمه بين من حضر من المسلمين، واترك الأرضين والأنهار لعمالها (أى لأهلها العاملين عليها) ليكون ذلك من أعطيات المسلمين، فإنا لو قسمناها بين من حضر، لم يكن لمن بعدهم شيء" . شیاوی ئاماژە بۆ کردنە عومەر لەم بڕیارەیدا مەشوەرەتی بە (عەلی کوڕی ئەبوتالیب و مەعازو عوسمان و طەلحە) کرد، ئەوانیش هەمان رایان هەبوو[٢٨].



(٢٨) سەیرێکی (الأموال لأبي عبيد) بکە.

## ئاوو ئاوه خۆره :

خوای به دەسەلات دەفەرموێ :﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ (الأنبياء: ٣٠). واته: بژێوی هەموو شتێك به ئاوه، دەسا بۆ باوەڕ ناهێنن ؟ ئاو یەکێکه له نیعمەته گەورەو مەزنەکانی خوای کارزان، به دەسەلات و توانایی خۆی فەراهەمی هێناوه بۆ ژیان و بژێوی ئەم بوونەوەره، له سوورەتی (واقیعه)دا دەفەرموێ :﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴾(الواقعة: ٦٨ – ٧٠).

واته: ئەو ئاوه ئێوه دەیخۆنەوه، ئاخۆ ئێوه له هەورەوه داتانباراندووه، یان ئێمه باراندمان؟ ئارەزووشمان هەبا دەمانکرده ئاوێکی تاڵ (بێ کەڵك و تفت) دەسا شوکرانه ناکەن ؟. ئاو یەکێکه لەو سێ شته گرنگانه که هەموو خەڵك تێیدا شەریك و هاوبەشه، وه نابێ هیچ کەسێکی لێ بێ بەش بکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ دەتوانێ ببێته خاوەنی کانیاوو، بیروو جۆگەکان، هەر وەك دەتوانێ ببێته خاوەنی زەویی و مەزراو کشت و کاڵ، به کڕین، یان به هەڵکۆڵینی زەویی، جا بەهەر کامێك بێت، مرۆڤ دەبێته خاوەنی ئاو بۆ خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك به گشتی تێیدا هاوبەشه، وه دەتوانێ تا خۆی پێویستی پێی هەبێ، نەیداته خەڵکانی تر، مەگەر له حاڵەتی نائاساییدا، چونکه له ئیسلامدا ڕێز له زەحمەتی زەحمەتکێشان دەگیردرێ، هەر لەبەر ئەمەیه له بوخاریدا هاتووه که پێغەمبەر (ﷺ) له بارەی ئەو کەسەی که دەڵێ: (إن صاحب الماء أحق بالماء حتى يروى..

واته: خاوەن ئاو شاییسته تره به ئاوەکەی تا کشت و لەوەڕگەکەی تێر دەکات) فەرمویەتی: ((لا يمنع فضل الماء ليمنع به الكلأ))[٢٩]. واته: نابێ ئاوی زیاد له پێویست، لەخەڵك قەدەغه بکرێت، دیاره لەوەیشەوه لەوەڕ کەم دەکات بۆ مەڕو ماڵات و تووشی لەڕیی و لاوازیی و زیان

(٢٩) أخرجه: البخاری (فتح الباری/كتاب المساقاة) (٢ /٢٣٥٣).

دەبن، ئەمەیش لەئیسلامدا قەبووڵ نیە، پێشەوا (مالیك) دەڵێ: سەبارەت بە مەزراو کشتیش وایە، ئەگەر ئاوێك زیاد بوو لە خاوەنەکەی نابێ لە خەڵك قەدەغە بکرێت.

تێبینی: لە فەرموودەی : ((لا يمنع فضل الماء ..)) وە زاناکان وەریان گرتووە کە: ئاوی زیاد رەوایە بفرۆشرێت. ئاوە گشتییەکان: ئەو چۆم و ئاوانەی لە بەهاراوەکان کۆدەبنەوە، یان ئاوی دەریاو زەریاو چۆمە گەورەکان – وەکو دیجلەو فورات – خەڵکان سەرجەم دەتوانن بێ هیچ فەرق و جیاوازیەك سوودیان لێوەرگرن، بۆ خواردنەوەو باخ و باخات و مەزراو کشتەکان، واتە: بە پێی ئەو یاسایە پێغەمبەر (ﷺ) داینا بۆ کەڵك وەرگرتن لە زەریاو دەریاو بەهاراوەکان، دەبنە دەسکەوتێکی گشتیی و بۆ هەموو خەڵکانی ئەو شوێنانە لێیەوە دێ و تێدەپەڕێ رەوایە سوودی لێوەرگرن.

(عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (رضي الله عنه) دەڵێت: پیاوێکی ئەنصاریی لەگەڵ (زوبەیر)دا هەراو کێشەیان بوو سەبارەت بەو باراناوو بەهاراوە کە لە (حەڕە)ی شاری (مەدینە)دا کۆ دەبووەوەو خەڵکان باخە خورماکانیان پێ ئاو دەدان، شیاوی ئاماژە پێکردنە، باخەکەی (زوبەیر) دەکەوتە لای سەرووەوە، ئەوسا (ئەنصار)یەکە بە (زوبەیر)ی وت: ئاوەکە بەرەڵا بکە با ئێمەیش لە خوارەوە سوودی لێوەرگرین، (زوبەریر)یش وەکو پێویست نەهات بە دەنگیەوەو کێشەکە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش فەرمووی: ((اسق يازبير ! ثم أرسل الماء إلى جارك)) واتە: مادام تۆ لە سەرەوەیت، ئاوی باخەکەت بدە، پاشان ئازادی بکە بۆ دراوسێکانت. بەلأم برا ئەنصاریەکە خراپ حاڵیبوو، بۆیە بە پێغەمبەری گوت: ئەم بڕیارەت لەبەر (زوبەیر)ی پوورزات بوو! پێغەمبەریش (ﷺ) روخساری پیرۆزی گۆڕاو گوتی: ((اسق يا زبير! ثم احبس الماء حتى يرجع إلى الجدر)) واتە: زوبەیر! ئاوی خورماکانت بدە تا ئاوەکە هەڵدەسێ و چاڵەکان پڕ دەبن، زوبەیر دەڵێ: سوێند بەخوا وامزانی بۆ کۆتاهێنانی ئەو کێشەیە ئەم ئایەتە هات:﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي

أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾(النساء: ٦٥). واتە: بێگومان ئەو خەڵکانە نابنە خاوەنی باوەڕی تەواو، هەتا تۆ نەکەنە (حەکەم) و دادوەر بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەکانیان و، پاشانیش بێ دڵ نیگەرانی تەسلیم دەبن بە بڕیارەکەی تۆ)[٣٠]. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: (عوبادەی کوڕی صامیت) دەڵێ: ((قضى ﷺ في شرب النخل من السيل، أن الأعلى فالأعلى يشرب قبل الأسفل، ويترك الماء إلى الكعبين، ثم يرسل الماء إلى الأسفل الذي يليه، وكذلك، حتى تنقضي الحوائط، أو يفنى الماء))[٣١]. مەبەست ئەوەیە کە ئەم هاوەڵەش پشتگیری هەر لەو بڕیارەی سەرەوە دەکات و، دووپاتی ئەوە دەکاتەوەو ئاگادارە کە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەی سەرەوە بڕیاریداوە.

زاناکان دەڵێن: ئەوکارەی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە بڕیارو یاسایەك بۆ هەموو مەزراو کشتێك — بەو جۆرە ئاوانە ئاو بدرێن — واتە: لە پێشەوە لای سەرو ئاو دەخوات، ئەوسا لای خواروو، ماوەی بەدەستەوە بوونی ئاوەکەش بە پێی باوو عورفی ناو چەکەیە، بەکات ژمێر دیاری دەکەن، یان بەهەر شێوەیەکی تر. بۆ زانیاری تەواو سەیرێکی (الأحكام السلطانية)ی (ئەبوو یەعلی) بکە.

__ئەنجامگیری__: خوای میهرەبان لە بنچینەدا زەویی — بە شیوو دۆڵ و چیاو شاخ و دەشتیی و دێمیی و بەراویی — بۆ سەرجەم ئادەمزادی بە دیهێناوە، واتە: هیچ جێگایەکی تایبەت بە کەسێکەوە نیە، هەتا نەهێڵێ کەسێکی تر، یان هۆزێك بچێتە ئەوێ سوودی لێ وەرگرێ، مەگەر بە یەکێ لە رێگا شەرعییەکان..

بۆ نموونە: ناوچەیەك چۆڵ و وێران، کەسێك دەچێ ئاوەدانی دەکاتەوە، دیارە بەوە دەبێتە خاوەنیی، وە هەر ئاوێکیشی هەبێ هەر دەبێتە موڵکیی و کەسێك بۆی نیە (موزاحەمە)ی بکاو زەویی و زارەکەی لێداگیر بکات، یان باخ و مەزراو کشت و کاڵی لەبەر

(٣٠) صحيح البخاري – كتاب المساقاة، باب سكر الأنهار – حديث : ٢٢٥٢

(٣١) صحيح، صححه الالباني فى سنن ابن ماجة برقم: ٢٤٨٣.

بکات، یان بچێت مێگەلێ بێنێت و خاوەن ئاوەکە دەر پەڕێنێ، ئەمانە هیچیان ڕێیان پێنەدراوە، مەگەر خاوەنەکەی ڕەزایەت بدات، هەروەها گوندێکی دراوسێ بۆی نیە بەبێ مۆڵەت، مەڕو ماڵات راگرێ و بێتە سنووری گوندەکەی ترو ئازاری دراوسێکانی بدات، بەڵام هەقە ئەنجوومەنی شارەوانیی ناوچەکە بپرسێتەوە لەو جۆرە شتانەو هەر گوندەی سنووری خۆی بۆ دیاری بکاو بیشیپارێزێت، شارەوانی زیرەکانە کار بکات، تەنانەتی ئەگەر گوندێك کاتی خۆی سنوورێکی زۆری بۆ خۆی دابڕیبێ، ئێستا شارەوانی دەتوانێ ئەندازەگیری بکاو بەشی پێویستی بۆ جیا بکاتەوەو ئەویدی بداتە دواوە بۆ گوندەکەی تر، هەر وەك هەقە ئەوانەی زەویی و زاری زۆریان هەیە، لێیان وەرگرێتەوەو دابەشی بکات بەسەر نەبووەکاندا.

سەرنجێک: ئەگەر کەسێك نیشانەی بۆ ئاوەدانکردنەوەی جێگایەك دانا، پاشان سێ ساڵی بە سەرا تێپەڕیی و ئاوەدانی نەکردەوە، ئەگەر هیچ بیانوویەکی شەرع پەسەندی نەبوو، میریی لێی دەسێنێتەوەو دەیداتە خەڵکانی تری موتاج بەو زەویە، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوە زەویەکە بێ دەرامەت و بەروو بوو نەمێننەوە، وەکو (عومەر) خوا لێی رازیی بێت – گوتی: (من أحيا أرضا ميتة فهي له، وليس لمحتجر حق بعد ثلاث سنين)[٣٢] واتە: هەر کەسێك زەویەکی ئاوەدانکردەوە دەبێتە هی ئەو، وە دوای سێ ساڵ راگرتنی و بەکار نەهێنانی بۆ هیچ شتێك، مافی نامێنێ بە سەریەوە، لەبەر ئەمەبوو (عومەری کوڕی خەتتاب – رضي الله عنه) ئەو زەویەی لە (بیلالی کوڕی حاریس) وەرگرتەوە کە کاتی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دابڕیبوو، پاش ئەوە دەرکەوت توانای ئاوەدانکردنەوەی نیە، پێیگوت: چەندەت پێ ئاوەدان دەبێتەوە، ئاوەدانی بکەوە، ئەوی دیکەشی بدەرە دواوە با بدرێ بەخەڵکانێکی لێهاتوو زانا وەبەری بێنێت، من بێگومانم ئەگەر وەزارەتی کشت و کاڵ و شارەوانی بە

(٣٢) (حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ, قَالَه عَلَى الْمِنْبَرِ. موقوف عن عمر رضي الله عنه، انظر: الخراج لأبي يوسف. (ئەمە تەنها وتەی ئیمامی عومەرەو فەرموودە نیە).

عەداڵەت لێبڕێن و، بچنە ناو کێشەکانەوە (عومەر) ئاسایی، زۆر بەسەر کەوتووانە چارەسەریان بۆ دادەنێن.

پێویستە ژیان و بژێوی جەماوەر — بێ پارتی زانی — هەڵسەنگێنرێ، هەر کەسێ لە دام و دەزگا دەوڵەتییەکاندا کارێکی پێدرابێ بۆ بژێویی، زەویی نەدرێتێ، بەڵکو بدرێ بەوانە لەماوەی تەمەنیاندا خەریکی (زاریع)ین ! بەشکو وردە وردە باری بژێوییان باش ببێ، ئەو کەسانەش وا خاوەنی (٧٠ – ٨٠)، دۆنم زەوین..، یان زیاتر، یان کەمترو خەڵکێکی زۆریش (سێیەکخۆرو چواریەکخۆرن) ئەوان بۆ خۆیشیان لە جێگایەکی سازگاردا لێی دانیشتون و، دەبێ هەموو ساڵێ بەروو بووی زەویەکەی بۆ بچێت، چارەسەرێکیان بۆ دابنرێت. تەنانەتی ئەگەر (تاپۆ)یشیان هەبێ، هەر دەبێ دەوڵەت بە مەسەلەکەیاندا بچێتەوە، چەندە بەشی ژیانیان دەکات، ئەوەندەیان بۆ دابنێت، ئەویتریشی دابەش بکات، بەڵکو سێیەکخۆرو چواریەکخۆر کەم ببێتەوەو ژیانیان ئاسایی بێتەوە، پێویستە ئەوەش بڵێین کە دەبێ دەوڵەت بۆیان قەرەبوو بکاتەوە، لە فەتاوای (خانی)یدا هاتووە: (ولو ضاق المسجد على الناس وبجنبه أرض لرجل تؤخذ أرضه بالقيمة كرها)[٣٣]. واتە: ئەگەر مزگەوتێك بچووك بوو و جێی خەڵکی تێدا نەدەبووەوە، لە تەنیشتیەوە پارچە زەویی کابرایەك هەبوو، ئەوە بەنرخی ڕۆژ لێی دەکڕدرێ و دەخرێتە سەری، ئەگەر بە زۆریش بووبێ ! چونکە زیانگەیاندن بە مەردم لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت، کارێکی نارەوایە تەنانەتی زیان بە خودی ئینسان خۆیشی هەر ناپەسەندە، ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((لا ضرر و لاضرار)) [٣٤] زاناکانیش ئەم یاسایەیان دارشتووە دەڵێن: (يتحمل الضرر الخاص لدفع ضرر عام)، یان (الضرر الأشد يزال بالضرر الأخف)..

(٣٣) سەیری: (الفتاوى الخانية) لقاضي خان، بكە (٣ / ٢٩٣).

(٣٤) صحيح، صححه الألباني في إرواء الغليل ٨٩٦.

لە گۆڤاری (الأحكام العدلية)، مادده (١٩٦)دا هاتووە: (يؤخذ لدى الحاجة ملك أي أحد بقيمته بأمر السلطان ويلحق بالطريق، ولكن لا يؤخذ ملكه من يده ما لم يؤد له الثمن) واتە: لەکاتی پێویستدا موڵکی هەر کەسێك پێویستبوو وەر بگیردرێ، بە نرخی رۆژ بە فەرمانی "میر" لێی وەر دەگیردرێ و کارەکەی پێ ئەنجام دەدرێ. بەڵگەشیان دەسکاری مزگەوتەکەی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، لەلایەن (عومەر)ـەوە، چونکە نوێژ خوێنەکان زۆر ببوون و جێیان نەدەبوویەوە، دەبوو فراوان بکرێ، ئەویش بەناچاری هەڵسا خانووەکانی دەورو بەری کڕیی و خستیە سەر مزگەوتەکە، ئەگەرچی هەندێکیشیان رازی نەبوون ! بەڵام دیارە کە بەرژەوەندی گشتی، لە پێش بەرژەوەندی تاکەوەیە.

مەبەستی ئێمەیش لە نووسینی ئەم کورتە باسەدا بێ ئەوە ئاماژە بکەین بە بنەما ئابوورییەکانی تر، تەنیا دەرکەوتنی راستییە بۆ گشت کەسێك لە گشت بوارێکدا، هیوادارم ئەو راستییە بسەلمێنین کە دینی ئیسلام هیچ گیروو گرفتێکی لە ژیانی مرۆڤدا نەهێشتوەتەوە بێ چارەسەر، بەتایبەتی ئەم مەسەلەی زەویی و زارە کە هەمووکات کێشەیەکی سەرەکیی و سەراسەری جیهانیە، ئەگەرچی بەداخەوە تا ئێستاش هەژارەکان وەك پێویست ئاوەڕیان بە لادا نەدراوەتـــەوەو نـــەبـــوونەتە خـــاوەنـــی زەویـــی و زاری خۆیان..

من دەڵێم: ئەگەر ئەم چەند بنەمایانەی خوارەوە کرابانە بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی شوێنە چۆڵ و وێرانەکان، ئەوسا بەتەواوی تێدەگەیشتین لە هەق و هەموو کەسیش بەشی خۆی زەویی و زاری بەردەکەوت، بۆ نموونە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

١- ((لا حمى إلا لله ولرسوله)) (٣٥)

٢- ((من أعمر أرضا ليست لأحد فهو أحق)) (٣٦)

(٣٥) صحيح البخاري -كتاب المساقاة، باب : لاحمى إلا لله ولرسوله صلى الله عليه وسلم - حديث : ٢٢٦٢.

(٣٦) صحيح البخاري -كتاب المزارعة، باب من أحيا أرضا مواتا - حديث : ٢٢٣١.

٣- ((لا ضرر ولا ضرار)) [٣٧]

پێشەوا (عومەر)یش دەڵێت:

١- (من عطل أرضا ثلاث سنين لم يعمرها فجاء غيره فعمرها فهي له).

٢- (لولا آخر المسلمين ما فتحت قرية إلا قسمتها بين أهلها كما قسم النبـي ﷺ خيبر).

٣- قال عمر بن الخطاب - لبلال بن الحارث حين ما أقطعه رسول الله ﷺ أرضا لإحيائها وعجز عن إحيائها -: ان رسول الله (ﷺ) لم يقطعك لتحجبه دون الناس، وإنما أقطعك لتعمر، فخذ منها ما قدرت على عمارته، و رد الباقي.

شاطبی دەڵێت: (المصالح العامة مقدمة على المصالح الخاصة).

<u>خوێنەری هێژا</u> ! هیوادارم توانیبێتمان روونکردنەوەیەکی پێویست بنووسین لەسەر ئەم بابەتە گرنگەیەو ئەو چەند فەرموودەو وتەی زانایانە ببێتە بنەما بۆ پێکەوە ژیان و قایل بوون بەڕێزو حورمەت بۆ یەکترو هیچ کەسێك بەناوی تەصەروف لەماڵی خۆیدا زیان بەوی تر نەگەیەنێت، چونکە هەرگیز خوای گەورە ئەوە قبووڵ ناکات، دەسەڵاتیشی داوە بە سوڵتەی شەرعیی ئەوە راست بکاتەوە، ئەگینا موڵکیەتی ئەو شتەی لێوەردەگرنەوە، چونکە شەریعەتی ئیسلام بۆ بەدەستخستنی بەرژەوەندییەکان و کامڵ کردنیان هاتووە، لەولایشەوە بۆ دەرگا داخستن لە رووی گشت مەفسەدەیەك و لەبن هێنانیەتی، ئەمەیە کە (ئیبن تەیمیە) دەڵێ: (جاءت الشريعة الإسلامية لتحصيل المصالح وتكميلها، وتعطيل المفاسد وتقليلها)[٣٨].

**لە سەرەتاو کۆتاییدا سوپاس و ستاییش هەر بۆ خوای میهرەبان و کارزان**



(٣٧) صحيح، صححه الألباني في إرواء الغليل ٨٩٦.

(٣٨) سەیری: (منهاج السنة) لابن التيمية (ب ٢ / ٣١).

# ٣- کشت و کاڵ و نەمام چاندن

## پێشنووسین:

دووپاتی دەکەینەوە کە ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، شەریعەت و بەرنامەی هەمووانە، شار نشین و گوند نشین و گەڕۆك و ئەهلی چادر، دەتوانین بڵێین بۆ هەر یەکەیان (خیتاب)ی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەرچی ئەمانە سەرجەم تەواوکەری کۆمەڵگەی ئادەمیزادن و خیتابی ئەمیان بۆ ئەویان دەشێ، لەم زنجیرەی سێیەمەشدا: (کێشە کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرییان لە ئیسلامدا، (٣) کشت و کاڵ و نەمام چاندن) لایەکی تری ژیانی مرۆڤ باس دەکەین، کە لەلایەکەوە پێویستی پێیەتی، لەلایەکی تریشەوە مایەی ڕازانەوەی دەشت و چەم و دۆڵ و شیوەکان و شەقام و جادەکانە بە جۆرەها دارو درەختی جوان و ڕەنگین، هەم خۆیان و سێبەرو بەرووبوومیان، هەم قەشەنگی وڵات و ناوچەکە نیشان دەدا، لەولایشەوە ئەو تۆو چاندن و دارو درەخت ناشتنە بەو شێوە سەرسووڕهێنەرە دەبێتە بەڵگەی خوایەکی بە تواناو بە دەسەڵاتدار، بۆ خۆیشی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ۝٦٣ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴾ (الواقعة: ٦٣ – ٦٤).

لەلایەکی تریشەوە گەورەیی و مەزنی ئیسلام نیشان دەدا کە چەندە بایەخ و گرنگی بە کشت و کاڵ و باخ و باخات دەدا ئەو دەمەی کە کەم کەس هەبووبێ بیری لە کشت و مەزراو باخ و باخات کردبێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا گیروگرفتێکی زۆر دێتە بەردەمیان لە کاتێکدا دەکەونە ناو ئیش و کارەکانەوە بە پشتیوانی خوای گەورە یەکە یەکە باسیان دەکەین و چارەسەریشییان بۆ دەڵێین.

**٢٧ی ڕەبیعی دووەم ١٤٢٤ی کۆچی**
**٢٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٣ی زایین**



## گەورەیی و مەزنیی کشت و نەمام ناشتن

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ما من مسلم يغرس غرسا، أو يزرع زرعا فيأكل منه طيرا أو إنسان أو بهيمة إلا كان له به صدقة))[٣٩].

هەر موسڵمانێك دارو درەخت بنێژێ، وە یان تۆو بچێنێ و کشت و کاڵی لێ سەوز ببێ، ئەوسا پەلەوەر، یان ئینسان، وە یان پاتاڵ لێی بخوات، بۆ خاوەنەکەی دەبێتە صەدەقەو خێرو قازانجی زۆری لێ دەبینێ لە قیامەتدا. واتە: هەتا ئەو باخ و باخاتەو، ئەو کشت و تەڕە کاڵەیە لێی بخورێ خێری ئەم بەردەوامە، ئەگەرچی خۆیشی مردبێت و موڵکەکەی کەوتبێتە دەستی ئەم و ئەو، تەنانەتی ئەگەر بە دزیش لێی بخورێ بۆ ئەم هەر دەبێتە خێرو چاکە.

شێخ ئیبنولحەجەری عەسقەلانی (٧٧٣ – ٨٥٢ك) دەڵێت: ئەم فەرموودەیە مرۆیەکان دنە دنە دەدات بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و کردنی بە باخ و باخات و کشت و کاڵ و تەڕە کاڵ و دانەوێڵە، هەروەکو ئاماژە دەکات کە هەموو موسڵمانێك دەبێ پیشەو ئیش و کاری خۆی بگرێ و بیکا بە سەرچاوەی ژیانی خۆیی و ماڵ و منداڵیی و، بگرە زیاتریش، هەتا بنێردرێ بەملاو بەولادا هاوڵاتیان ئاتاج و موتاجی زلهێزەکان نەبن و لە ئەنجامدا ببنە کۆیلەو ژێر دەستیان لەبەرامبەر فەردەی ئاردو برنجەوە..!!

کەسێك پێی وابێ پاڵدانەوە چاکترە تا پیشەو پیشەسازی، عیبادەت و خواپەرستی و نوێژو ڕۆژو باشترە تاخۆ سەرقاڵ کردن بە دونیاوە، ئەوە بیرو ڕاو بۆچوونێکی فاسیدو هەڵەیە، بەڵام گومانیش نیە ئەگەر هەوڵەکان هەر هەموو ببنە هەڵپەی دونیاو پشت لە قیامەت هەڵبکرێ، ئەوە هەڕەشەی زۆری لەسەر دەبێ و خوا زەلیلی دەکا، وەکو لە دواترەوە دێت.

---

(٣٩) أخرجه: البخاري (فتح البارى/ كتاب الحرث والمزارعة)(١/ ٢٣٢٠).

سەیرو سەمەرە ئەمەیە ناوچە ئیسلامییەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە خوای گەورە وای بە دی هێناون خاوەنی دەشت و چۆم و کانیاوو زەریاو دەریایەکی زۆر بن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەچوون لە ئەمریکاوە ئاردیان بۆ دەناردن، تەنانەتی لە ساڵەکانی ڕابردوودا خەڵك زۆر برسی بوو، لە ئەمریکاوە ئاردیان دەهێناو بە (سلفة) دەیاندا بە مەردمە بێچارەکە، ئەگەر بشلێیت خۆ ولاّتەکەمان (مستعمرة)ی ئینگلیزیش بوو، بەلاّم خۆ دیارە هەرگیز خەڵکانی نەیار بیــرێ لەوە ناکەنەوە کە تۆ تێر ببی و پێویستت بــەوان نــەبێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو هەوڵێکیان ئەوەیە موسڵمانان لە برسانا کۆیلەی بەردەستیان بن و هەمیشەو هەمیشە ئەڵقە لە گوێیان بن، ئەمەیە کێشەی کۆمەلاّیەتی و ئابووریی.

ئیسلامیی پیرۆز فەرمان دەدا کە موسڵمانان بۆ خۆیان بژیین و لە ژێر سێبەری ئەم و ئەو بێنە دەرێ و تەنیاو تەنیا پشت بە خۆیان ببەستن و نەبنە کۆیلەو ژێر دەستەی هیچ ولاّتێك، بەلاّم پێیان دەڵێ – لەگەڵ پاراستنی ئازادی و سەربەخۆیی – کە لەگەڵ دەوڵەتەکانی دونیادا پرۆتۆکۆلات ئیمزا بکەن لەبارەی پیشەسازی و کشت و کاڵ و باخ و باخاتەوە ڕاو بۆچوون ئاڵووگۆڕ بکەن و خوێندکار بنێرن بۆ وەپێش بردنی ڕادەی کشتوکاڵ، بەتایبەت ئەمڕۆ کە زۆر بە ئاسانتــر دەس دەیگاتێ، گیــرو گرفتەکانی ولاّتی ئیسلامیی ئەمەیە کە کاربەدەستەکانی بوونەتە پیاوی ئەم و ئەو، ئەوان دەتوانن سوود لە عەرزو کانیاوو ناوچەکانی ئێمە وەرگرن، بەلاّم لە بەرامبەر ئەوەوە ناتوانن لە ڕووی پیشەسازییەوە پرۆتۆکۆلاتێك بێننە ئیمزا هەتا وردە وردە خۆمان ئازاد بکەین و ئەگەر ڕۆژێکیش بیــر لە ئازادی بکەینەوە نەتوانن گەمارۆی ئابووری بخەنە سەرمان، بۆیە لە دامێنی نووسینی ڕاڤەی ئەم فەرموودەوە داوا لە موسڵمانە دەوڵەمەندەکان و حکومەتەکان دەکەم خۆ ئازاد بکەن و عەرزو ئاوەکانمان بە باش و بە شێوەیەکی زانستانەی ئەمڕۆ بۆ وە بەربهێنین.



## وشیاربه زێدەڕەوی له كشــتو كاڵدا مەكـــە.!

(ئەبوو ئومامەی باهیلی) جارێك گاسنێك و چەند ئامێرێكی تری جووت و تۆو چاندنی دیت و پاشـــان گوتی: له پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((لايدخل هذا بيت قوم إلا أدخله الله الذل))[٤٠] ئەم گاسن و هەوجارە بچێتە هەر ماڵێك، خوا زەلیل و ڕیسوای ئەكا، مەبەست ئەوەیە دەكەوێتە ژێر داواو تەڵەبی كاربەدەستەكان و ئیش و كارێكی قورس و سەخت دەدەن بە سەریاو ئەوكات هەمیشە دەبێ كاری پێ بكەن، یان مەبەست ئەمەیە كە موسڵمانان لەباتی خۆ خەریككردن بە ئیش و كاری جیهادەوەو، لەباتی ئەوە خۆ ئامادە بكەن بۆی، بچن خۆ خەریك بكەن بە كەشاوەرزیی و كشت و كاڵەوەو سەر بكەنە دونیای ماددەو پشت له كارووباری جیهاد هەڵبگرن، گومان نیە، ئەوانەی سەر دەكەنە دونیای تەمەح و بازرگانیی و فەلاحەت و مەزراو كەشاوەرزیی و هەر كارێكی تر زۆركەم توانای جیهادیان دەمێنێ و، زۆر كەمیش خۆ تێ دەگەیەنن، ئەوسا ئیتــر خەڵكانی نەیاری ئیسلام بە ئارەزووی خۆیان وڵاتە ئیسلامییەكـــان ســـــاڵ دوای ساڵ داگیــر دەكەن و كەسێكی وایش نییە دیفاع و بەرەوانی لێ بكەن، كەوابوو هەر عیبادەتێ — نـــەك بازرگانی و كشت و كاڵ — مرۆڤ له جیهاد وەرگێڕێ خوا خۆشی ناوێ و، دەبێ موسڵمانانیش سەرانەی بدەن وەكو دەیبینین لێرەو لەوێ.

ئەمەیە كە دینی ئیسلام بەرنامەیەكی مامناوەندییە، وازهێنان له دونیا كارێكی نەشیاوو ناپەسەندە، باوەش كردنیش بە دونیاداو هەموو ئاوات و مەبەستێك هەر ئەو بێت، دیسانەوە ناڕەواو نەشیاوە، نابێ بەناوی (زوهد)ەوە زاوییەكی مزگەوت هەڵبژێردرێ و دەرگاو پەنجەرەكانیش پێوە بدرێ با دونیا نەبینێ.! له ئەنجامدا نەیاران و ناحەزان بە ئارەزووی خۆیان دونیا بخەنە ژێر ئەژنۆیان و من و تۆیش و ماڵ و مناڵیشمان دابمێنین بۆ پاروویە نان.

**بە كورتی:** دەبێ (تەوازن) ڕابگرین، نە شەوو ڕۆژ مزگەوتەكان جێگامان بن، نە دەشبێ هەمیشە خەریكی ماشین حیساب بین، دەبێ ڕۆڵەی هەردوو بوارەكە بین، نان پەیداكردن و

(٤٠) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب الحرث والمزارعة) (٢/ ٢٣٢١).

زۆرکردنی بەروو بوو بۆ وڵات و نیشتمان – تا نەبێتە کۆیلەی ژێر دەستی کوێخاکانی دونیاو – نەتوانن هەرکات ئارەزوویان هەبوو برسیمان بکەن و بچینە ژێر بارییان، هەوڵی ئاوا لە هەزاران هەزار نوێژی سوننەت و حەج و عومرە گەورەترە، سا خوایە ژێر دەستەی دەستی نەیارانی ئیسلاممان نەکەیت.



## کشتوکـــاڵ لە بەرامبـــــەری بەشێک
## لە دەرامەت و بەروبووی زەوییەکەوە ڕەوایە.!

هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) – بە تایبەت مەدەنییەکان – ڕاو دەنگیان هەیە کە وەرگرتنی پارچە زەوی لە خاوەنەکەیی و کردنی بە کشت و کاڵ شتێکی ڕەواو درووستەو، هیچ کامێکیشیان پێچەوانەی ئەمەیان لێ نەبیـسراوە، هەر بۆیە (قەیس)ی کوڕی (موسلیم) لە (ئەبوو جەعفەر)ەوە دەڵێت: هەموو ماڵە موهاجیرەکانی مەدینە خەریکی کشت و کاڵ بوون بە سێ یەك، یان بە چوار یەك، (عەلی کوڕی ئەبوو تالیب) خۆیشی پارچەیە زەوی گرت بە نیوەیی، (عەبدوڵلاّ)ی کوڕی (مەسعود) بە سێیەك و چوار یەك، (عومەر)ی کوڕی (عبدالعزیز) نامەی نووسی بۆ (عەدی) کە بە سێیەك و چوار یەك کشت و کاڵ بکە، (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) پاش ئەوە نەجرانییەکان و جوولەکەو گاورەکانی دەرکرد، زەویی و زارو باخە خورماو ڕەزەکانی لێ کرین و پاشان لەگەڵ خەڵکەکە وا پێکهات: کە ئەگەر تۆوەکە هی عومەر بوو، زەوییەکە هی ئەوان، ئەوا نیوەی دەرامەتەکە بۆ عومەر دەبێ، خۆ ئەگەر تراکتۆرو جووت و هەوجارەکە هی ئەوان بوو، ئەوا سێیەکی بۆ عومەرو دووبەشی بۆ ئەوان، لە باخە خورماکاندا لە گەڵیاندا ڕێککەوت کە پێنج یەکی بۆ ئەوان بێت و ئەوی تری بۆ ئەو..

لە ڕەزەکانیشدا: دوو بەشی بۆ عومەرو بەشێکیشی بۆ ئەوان، جا کەوابوو ئەو کاروکردەوەی هاوەڵانە بەو جۆرە بەڵگەی ئەوەیە کە (موساقات) و (موزارەعە) دوو کاری ڕەوان و هەتا قیامەت بۆ موسڵمانان دەشێ زەویی و زار لە یەکتـر بگرن و بیکەنە کشت و کاڵ لە بەرامبەر بەشێك لە دەرامەتی زەوییەکەوە (بەرووبوو، وە یان گەنم و دانەوێڵە) بێ ئەو کاری هاوەڵانەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا کۆچی دوایی کرد عەرزەکانی (خەیبەر)ی دابوویە جوولەکەکان بیکەنە کشت و باخەکانی ئاو بدەن لە بەرامبەر بەروو کشتەکەیەوە: ((عن ابن عمر (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) عـــامل أهـــــل خيبـــر بشطر مايخرج منها من ثمر أو

زرع))[٤١]. بۆ دواییش خەلیفەكانی درێژەیان بەو كارەیەدا، بە دیاریش دەكەوێ كە تۆم و بنەتۆمی پێ نـــــەداون.

لە فەرموودەیەكدا هاتووە: ((أن رسول الله (ﷺ) نهى عن المزارعة وأمر بالمؤاجرة...))[٤٢]. كە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێی لە (موزارەعە) گرت، بەڵام فەرمانی بە كرێ دا، دیارە چەند فەرموودەیەكی تر هەن كە ڕێ لە (موزارەعە) دەگرن، بەڵام زاناكان بۆ ڕێكخستنی نێوان ئەو فەرموودانە ڕێگا بە موزارەعە دەدەن و، ئەوانەش ڕێگە نادەن چەند قسەیەكیان هەیە، گونجاو ترینیان ئەمەیە كە لە سەرەتای كۆچی (موهاجیرین)ــەوە بۆ مەدینەو نەدارییان و پێویستیان بە ئیش و كارو كەشاوەرزی هەبوو، خۆیشیان هیچ زەویی و زارێكیان نەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە (ئەنصار) كرد كە ڕێز لە (موهاجیــرین) بگرن و لەباتی ئەوە زەوییەكانیان بە كرێ و (موزارەعە) بدەنێ بە پیاوەتی و خۆڕایی بیاندەنێ، وەكو ئیمامی موسلیم لە (جابیــر)ەوە هێناویەتی: (كان لرجال من الأنصار فضول أرض وكانوا يكرونها بالثلث والربع فقال النبى (ﷺ): ((من كانت له أرض فليزرعها أو ليمنحها أخاه فإن أبى فليمسك أرضه)) [٤٣] و دەڵێ: خەڵكانێكی یارمەتی دەران "ئەنصار" زەویی و زاری زیاد لە خۆیانیان هەبوو هەڵدەسان دەیان دایە كرێ بە سێ یەك و چوار یەك، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەوی زەوی هەیە، دەبێ یا خۆی بیكاتە كشت و كاڵ، یان دەبێ بیبەخشێ بە برا (موهاجیر)ەكەی، یاخێر دەبێ ڕایگرێ و نەیكا بە هیچ شتێ. بەڵام بۆ دوایی كە خوا حاڵی موسڵمانانی باشكرد، خاوەن موڵكەكانی ئازاد كرد كە بە هەر شێوەیەك كار ئەكەن لە عەرزەكانیاندا دەتوانن.

(ئیبن عەبباس) دەڵێت: مەبەست بەو فەرموودە ڕاهێنانی موسڵمانانە بۆ پیاوەتیی و هاوكاریی و جوامێریی لەگەڵ یەكتــردا، هەڵیان دەنێ كە ئەگەر بۆشیان هەبێت بە كرێ

(٤١) أخرجه: مسلم (باب المساقاة / ٤٠٤٤).

(٤٢) أخرجه: مسلم (باب فى المزارعة والمؤاجرة / ٤٠٣٨)

(٤٣) رواه مسلم ، انظر مشكاة المصابيح، رقم الحديث: ٢٧٩٩.

بدەن، برایەتی موسڵمانانە زۆر بەهێزترەو هەوڵ بدەن گشت وەکو یەك بژین، گومانیش نییە — وەك لە زنجیرەی (٢)دا گوتم — هەقە مەسەلەی زەویی و زار ئێستا دەستکاری بکرێت و نەهێڵرێ سێیەك و چوار یەك... هتد. بمێنێ، بەڵکو خاوەن زەوییەکە چەندەی پێ دەکرێ، ئەگینە زەوی تری لێ بسەنرێتەوەو بدرێ بە چەند خانەوادەیەکی تر تا دەبووژێنەوەو لەو سێیەکە ڕزگار دەبن.

من وانازانم تا ڕۆژی قیامەت هەر دەبێ ئەو زەویی و زارانە بە دەست خەڵکێکی تایبەتییەوە بن، بەڵکو سوڵتەی شەرعی چۆن بەرژەوەندی دەبینێتەوە، دەبێ وای لێ بکا، ئومێدەوارم وەزارەتی کشتوکاڵ زۆر بە ژیرانە پەیگیری ئەو مەسەلەیە بکاو زاناکانیش بە بوێرانە بڕیار بدەن بۆ قەلاچۆکردنی هەژاریی و نزیك خستنەوەی ژیانی داراو نەدارەوە.

بێگومانبە لەم فەرموودەیەوە: ((من كانت له أرض فليزرعها أو ليمنحها أخاه، فإن أبى فليمسك أرضه))[٤٤]. زوو پێخۆشبوونی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر ڕوون و ئاشکرایە، پێیخۆشە، ئەگەرچی هەقی ئەوەشیان هەبێ زەوی خۆیان بە کرێ و بە (موزارەعە)ی سێیەك و چوار یەك بدەن، بەڵام مافی برایەتیی و هاوەڵایەتیی و مرۆڤایەتی داوای پیاوەتیی و هاوکاریی باشتـر دەکات، دیسانەوە کە لەسەرەتای ئیسلامەوە ڕێی لێگرتن زەوییەکانیان بە کرێ بدەن و فەرمووی: ((من كانت له أرض فليزرعا، او ليمنحها، فإن لم يفعل فليمسك أرضه))[٤٥] هەرکەسێك زەوی هەیە، یا خۆی بیکاتە کەشاوەرزیی و کشت، وە یان بیبەخشێ بە (برا)کەی، ئەگەر ئەم دوو شتەی نەکرد زەوییەکەی بهێڵێتەوەو دەستکاری نەکا، واتە: نەیدا بە سێیەك و چوار یەك و...هتد.

---

(٤٤) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب الحرث والمزارعة) (١٨/ ٢٣٤١).

(٤٥) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب الحرث والمزارعة) (١٨/ ٢٣٤٠).

دەیەوێ ئەو خەڵکە هەموو زەویی ببێ و بیکەنە کشت و کاڵ و سێیەك و چوار یەك.. بنەبڕ بکا، کەواتە ئەگەر ئێستا باشتــر بچینە ناو کێشەکەوەو لە گشت دەقەکان وردبینەوەو (المقاصد العامة)ی شەریعەتی ئیسلام لێك بدەینەوە ڕوونتــر مەبەستەکان ئەدرەوشێنەوە.

**کورتەی مەبەست:**

سوڵتەی شەرعی دەبێ دەسەڵاتی ڕەهای هەبێ بەسەر گشت بەرژەوەندییە مرۆییەکاندا، بەرژەوەندیی لە چییدا دێتەوە دەبێ وا بکا، بەتایبەت لەم مەسەلەی (موزارەعە)و (موخابەرە)و زەویی و بە کرێ دانە بە سێیەك، یان بە نیوەیی، وە یان کەمکردنەوەی ڕێژەی موڵکایەتی جوتیارەکان و دابەشکردنی بەسەر خەڵکانی تردا — بەپێی یاسا شەرعییەکان — مەسەلەی نەمام ناشتن و دانانی باخ و باخاتیش هەر دەبێ سوڵتەی شەرعی بڕیار بدا لەوەدا: ئەو زەوییە بە باخە هەنار بکرێت، بە باخە هەنجیر بکرێت، یان بە هەر جۆرێکی تر، هیوادارم گشت هەوڵێکمان گەڕانەوەی دەسەڵات و سوڵتەی شەرعی بێت و کێشەکانیشمان هەموو بدەینە دەستی ئەو بۆ چارەسەرییان.

لە کۆتایی و سەرەتادا سوپاس و پێزانینم هەر بۆ خوایە کە هاوکاری کردم بۆ نووسینی ئەم کورتە باسەیەو لێیشی دەپاڕێمەوە هەموو شتێکمان ئازاد ببێ و لە ژێر چنگی ناهەقیکاراندا بێتە دەرێ و، ئابوورییەکی ئازادی شەرعیی بۆ وڵات وە پێش بەریین. ئامین.



# ٤ - ڕەهن، یان بارمتە

## پێشگوتار:

هەرشتێ خزمەتی ئادەمزاد بکاو لە بەرژەوەندی ئەودا بێت، ئەوا لە شەریعەتی ئیسلامدا ڕێ پێدراوە، هەر شتێکیش لە بەرژەوەندی ئەودا نەبێت ڕێی لێ گیراوەو نابێ بیکا، کڕین و فرۆشتن ڕێی پێدراوە بە مەرجێ فرۆشراوەکە بیـنـرابێ و ئامادەبێت و بەهاکەیشی ئامادە بێت، کەچی هێندێ کات کڕیار پێویستی بەو شتەیە بیکڕێ، بەڵام قیمەت و بەهاکەی ئامادە نییە، لەم حاڵەتەدا شەریعەتی ئیسلام ڕێگە دەدا کڕیارەکە ماڵە کڕاوەکە وەرگرێ، جا بۆ ئەوەی فرۆشیاریش (نرخ) و بەهاکەی لە کیس نەچێت دەتوانێ شتێك بە (ڕەهن) وەرگرێ لە بارمتەی ماڵە فرۆشراوەکەیدا، هەتـا پارەکەی بۆ دێنێ، ئەمەیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی ئەوەی کرد، وەکو خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((إشتـرى رسول الله ﷺ من يهودي طعاما ورهنه درعه))[٤٦].

وە یان قەرزو دەستەوام، کۆمەڵگەی ئادەمیزاد هەرگیز ناتوانێ بێ قەرز کردن لە یەکتـری بژی، جا بۆ ئەوەی قەرزەکەی لە ڕووی تەماحێکەوە نەبێ و قازانجێکی بۆی نەبێ و هەر لەبەر خاتری خوا بێ و، لەملایشەوە بۆ ئەوەی خاوەن قەرز دڵنیا بێت کە قەرزەکەی نافەوتێ، دینی ئیسلام ڕێگە دەدا کە قەرزارەکە شتێك بخاتە ڕەهن و بارمتەی خاوەن قەرزەکەوە، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا ئەگەر کابرای قەرزار لات و بێ دەسەڵات کەوت ڕەهنەکە بفرۆشرێ و پارەکەی ئەمی لێ بدرێتەوە، هەر ئەمەیە کە قـورئـانی پیـرۆز دەفـەرموێت: ﴿ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ ... ﴾ (البقرة: ٢٨٣). ئەگەر لەسەفەر بوون و نووسەرتان بۆ پەیدا نەبوو (قەرزەکە لە نێوانتاندا بنووسێت)، دەبێ بارمتە وەرگرن، مەگەر لێك دڵنیابن، دیارە ئەو کاتە بارمتـەی ناوێ و ئارەزووی خۆتانە.

بەپشتیوانی خوای لە کارزان ئەم ڕەهن و بارمتەیە ئەمجارە دەنووسین و کێشـەکـانی دەخـەینە ڕوو ئەوساش چارەسەرەکەی لە ئیسلامدا.



(٤٦) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب الرهن) (٢٥١٣/٥).

# ڕەهن، یان بارمتە

زانا شەرعزانەکان دەڵێن: ڕەهن، بەو ماڵ و سامانە دەڵێن کە دەبێتە بارمتەی قەرز بۆ ئەوەی هەرکات قەرزارەکە نەیتوانی قەرزەکە ببژێرێ ئەو ماڵەیە بفرۆشرێ و ئەو قەرزەی لێ بدرێتەوە، ئەمەیش بە پێی قورئان و فەرموودەو ئیجماعی زاناکان ڕەوایە.

ڕەهن: لە سەفەرو ماڵەوە ڕەوایەو شەریعەتی ئیسلام ڕێی پێداوە بۆ چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە هەتا دونیا دونیا بێت مرۆڤ هەر پێویستی بە جموجووڵ و بزووتن و خواردن و خۆراك و گوزەران هەیە، دیاریشە کە هەندێ جار مرۆڤ بە تەنیا پێویستییەکانی خۆی بۆ جێبەجێ نابێت، هەندێ جار مامەڵەیە قەرز ئەکاو، هەندێ جار پارەو شتوومەك قەرز ئەکا، جا بۆ ئەوەی ژیان بە ڕێکوپێکی بڕوات و هیچ کەسێکیش تووشی زیانی مادی نەبێت، مۆڵەت دراوە مامەڵە بە قەرزو، قەرز وەرگرتن بۆ ماوەیەك، دیسانەوە بۆ ئەوەش خاوەن قەرز دڵنیابێ لە قەرزەکەی تا نەفەوتێ دەتوانێ بارمتەیەك لە قەرزارەکە وەربگرێت.

ئەنەس دەڵێ: ئەمە سوێند بێت پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرامبەر چەند مەنێ جۆوە کلاوخوودەکەی خۆی خستە ڕەهنی جوولەکەیەکەوە، جارێك هێندێ نانی جۆو پێوێکی بۆ گەنم برد بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش فەرمووی: **((ما أصبح لآل محمد (ﷺ) إلا صاع ولاأمسی، وانهم لتسعة أبیات))**[٤٧].

ئێوارەش و بەیانیش ماڵ و منداڵی موحەممەد (ﷺ) تەنیا مەنێك خۆراکیان بووە، بۆیە ناچاریش بوو بچێت چەکەکەی خۆی بداتە بارمتەی جوولەکەیەك. !

زاناکان دەڵێن: حیکمەتی قەرزکردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە کابرایەکی جوولەکەو لە هەمانکاتدا هێندێ ماڵە دەوڵەمەندی هاوەڵان هەبوو، یان بۆ ئەوەیە خەڵکی تێ بگەیەنێت کە مامەڵە لەگەڵ جوولەکەدا ڕەوایە — بەو هۆیەوە نەکەوینە ژێر گووشارییان — یان لەوانەیە هیچ کامێك

(٤٧) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ کتاب الرهن) (١/ ٢٥٠٨).

لە هاوەڵاّن لەو وەختەدا شتێکی زیاد لە خۆیانیان نەبووبێ، یان لەبەر ئەوە بوو کە نەوەك بەهای لێ وەرنەگرن و شەرم بکەن.

رێنمایی ئەم فەرموودەیە:

یەکەم: مـــــامەڵە لـــــەگەڵ خــــوا نەنــــاس و کافراندا ڕەوایە، بە مەرجێ ئەو شتە لای ئێمە حەرام نەبێ.

دووەم: درووستە مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا کە زۆربەی ماڵیشیان حەرام بێت.

سێیەم: فرۆشتن و بارمتەو بە کرێدانی چەك بە کافری غەیرە حەربی ڕەوایە.

چوارەم: شتوومەك کڕیین بە پارەو بەهای قەرز بۆ ماوەیەك و چەك و وەسائیلی جەنگی بکرێتە بــــــارمتـــــە.

پێنجەم: حاڵەت و وەزعی زوهدی پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی دونیاداو گوێ نەدان بە دونیا ئــــــەگەرچــــــی دەسەلاّتیــش هەبێ.

شەشەم: ئەو متمانەو باوەڕ بەخۆ بوونە، کە ئەوەندە زەخیرەی دانەنابوو هـــــەتـــــا پێــــویستی بەو جوولەکەیە نەبێت.

حەوتەم: ئارام و خۆگرتن لەبەرامبەر دەستەنگیی و نەبوونییەوەو بە کەم ڕازی بوون.

هەشتەم: گەورەیی و مەزنی ژنەکانی بەرامبەر بەو دەستەنگییەی پێغەمبــــــەری خـــــوا (ﷺ)...!



## چەکیش دەخرێته بارمته

جابیــر دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کێ خۆی فیدایی ئەکات بۆ کوشتنی (کەعب)ی کوڕی (ئەشرەف).؟! چونکە بەڕاستی (پەیمانەکەی هەڵوەشاندووەتەوە)و دژایەتی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، (موحەممەد)ی کوڕی (مەسلەمە) گوتی: من ئامادەم. پاشان هەڵساو چوویە لایی و گوتی: هاتووین (وەسق)ێك تا دوو (وەسق) خورمامان بدەیتێ بە قەرز. کەعب گوتی: دەبێ ژنەکانتان بخەنە بارمتەم، گوتی: جا چۆن دەبێ خۆ تۆ پیاوێکی جوامێری عەرەبی..؟!! گوتی: دەسا کوڕەکانتان بخەنە بارمتەوە، گوتیان: نابێ، چونکە بۆ دوایی دەبنە پەندی دونیاو پێیان دەڵێن: بۆ وەسقێ تا دوو وەسق خورما خراونەتە ڕەهنەوە.؟! ئەمەش دەبێتە عەیب و عار بۆمان، بەڵام ئامادەین چەکەکانمان بخەینە بارمتەتەوە، دیارە ڕازی بوو و بڕیار بوو بۆی بهێنن، بەڵام فرسەتیان لێ هێناو کوشتیان و گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و دەنگ و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە.

دیارە ئەم کاروکردەوەیە، واتە: فرت و فێڵ بۆ خۆ گەیاندنە لای ناحەزو نەیاری موسڵمانان ڕەوایە، بۆیە (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)ش ئەو بەڵێنەی دایەو وردە وردە هێور بوویەوەو تا توانی دەستی بگاتێ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((قد عنانا وسألنا الصدقة ... فلم يزل يكلمه حتى استمكن منه فقتله))[٤٨].

لەلایەکی تریشەوە ئەم جۆرە جموجوولانە لە بابی (الحرب خدعة) واتە: باشتــرین جەنگ بەکارهێنانی هۆو ئەسبابە بۆ خۆ لادان لە ڕووبەڕوو بوونەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە گرنگ ناوی بردو فەرمووی: ((الحرب خدعة)) [٤٩] ، وەك دەڵێ ((الحج عرفة)).[٥٠]



(٤٨) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب الجهاد والسير) (١٥٨/ ٣٠٣١.).

(٤٩) صحيح البخاري –كتاب الجهاد والسير – باب : الحرب خدعة – حديث : ٢٨٨٦

(٥٠) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب الجهاد والسير) (١٥٧/ ٣٠٢٧).

## بارمتە وەرگر (مرتهن) نابێ سوودو قازانج لە بارمتەکە وەرگرێت

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((الرهن يُركب بنفقته، ويشرب لبن الدّرّ إذا كان مرهونا))[٥١]. حەیوانێك خرابێتە ڕەهنەوە بە ئەندازەی ئەو بەخێوکردن و ئالیك پێدانەی، ڕەهن وەرگرەکە دەتوانێ سواری ببێ، وە یان ئەگەر حەیوانی شیـردار بوو بە ئەندازەی بەخێوکردنەکەی شیرەکەشی بخوات.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوانەیە دەڵێن: بۆ (مرهتن) هەیە کەڵك و سوود لە (بارمتەکە) وەرگرێ، ئەگەر هەڵدەسا بە بەخێوکردنی، وە یان بە ئاودانی باخەکە، وە یان....هتد. خۆ ئەگەر هیچ ئەرك و تەکلیفێکی نەبوو، نابێ سوودی لێ وەرگرێ، بەڵام جەماوەری زاناکان دەڵێن: (مرهتن) بە هیچ شێوەیەك نابێ سوودو بەهرە لە (مەرهوون)ـەکە وەرگرێ.

فتح الباری دەڵێت: ((ذهب الجمهور الى أن المرتهن لاينتفع من المرهون بشيء)). هەریەکەشیان بەشێوەیەکی شیاوو گونجاو تەفسیـری فەرموودەکەی سەرەوەیان کردووەتەوە.

بەڵێ... ڕەهن، یان بڵێین بارمتە، تەنیا بۆ ئەوەیە کە فرۆشیاری بە قەرز، وە یان خاوەن قەرز دڵنیابێ لە تیانەچوونی قەرزەکەیی و، دڵنیابێ ئەگەر ڕۆژێ وە پێش هات و پارەکەی دوا کەوت، قازی دەتوانێ بارمتەکە بفرۆشێ و قەرزەکەی ئەوی لێ بداتەوە، ئیـتـر ڕەهن لەمە بەملاوە بۆ شتێکی تر نابێت، وە هەرگیـز لە موڵکییەتی خاوەنەکەی دەرناچێت، نە خۆی، نە قازانج و بەهرەکەی، کەوابوو ئەگەر کابرایەك خانوویەك، یان دووکانێکی خستە ڕەهنەوە، دەبێ هەموو تەسەڕووفێکی بە دەست خۆی بێت، خۆی بیدا بە کرێ و کرێکەیشی بۆ خۆی دەبێ..

---

(٥١) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب الرهن) (٤ / ٢٥١١).

بەڵام بەداخەوە لە زۆر جێگادا دەبینی بارمتە وەرگرەکە خانووەکە، یان دووکانەکە، هەتا قەرزەکەی وەردەگرێتەوە کرێ و هەر خێرێکی تری هەبێ ئەو دەیبات و قەرزیشی هەر قەرزە، واتە: لەوانەیە بارمتە دەرەکـــــە دوو ساڵ، یــــان زیاتر نــــەتوانێ قەرزەکە بداتەوە، ئەمیش لەلایەکەوە کرێ دووکان، یان کرێ خانوو وەردەگرێت و قەرزەکەیشی هەرکات وەرگرتەوە قبووڵی ناکات دینارێکـــــی کـــــەم بێــــــت..!

هیوادارم بتوانین حیکمەتی (ڕەهن) بەشێوەیەکی واقیعانە دەرك بکەین و تێبگەین و ستەمکاریی و ناهەقی بەرامبەر یەکتــر نەکەین، ئەوەش بزانین هەر خێرو قازانجێکی لەو بارەیەوە دەسکەوێ بە سوودو ڕیبا دادەنرێت، خۆشیان دەزانن تاوان و تۆڵەی سوودخۆر چەند گەورەیە..!

لە کۆتاییدا دەخوازم گشت ئیش و کارەکانمان موسڵمان بکەین و بەپێی شەرعی خوا ڕەفتار بکەین، چونکە ئێمە موسڵمانین و، بەرنامەو شەریعەتی ئێمە ئەم قورئانەو فەرموودەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)، لەوە بەولاوە نابێ چاو ببڕینە ئەم و ئەوو سوود خۆرە "غەرب زەدەکانی" لای خۆیشمان، کە هەموو ئاواتێکیان تێرکردنی ورگ و گەدەو کۆکردنەوەی ماددەو دونیایە، تەنانەتی دەرگای گشت پیاوەتیی و جوامێرییەك لە ڕووی گەل و نیشتمان دادەخەن..!



## بارمته لای غه‌یره دینیش داده‌نرێت

خاتوو عائیشه (خوای لێ ڕازی بێت) ده‌ڵێت: ((إشتـــرى رسول الله (ﷺ) من يهودي طعاما ورهنه درعه))[٥٢]. پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) خۆراكێكی له‌ جووله‌كه‌یه‌ك كڕیی و كڵاوخووده‌كه‌ی خۆی به‌ بارمته‌ لا دانا، پێش تریش خاتوو عائیشه‌ فه‌رمووده‌یه‌كی هه‌ر له‌م چه‌شنه‌ی باسكرد، بوخاری بۆ ئه‌وه‌ی هێنا كه‌ مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵ غه‌یره‌ دیندا ڕه‌وایه‌.



## ئه‌گه‌ر خاوه‌ن بارمته‌و، بارمته‌ لا دانراو هه‌راو كێشه‌یان بوو..؟

(ئیبن ئه‌بی موله‌یكه‌) ده‌ڵێ: سه‌باره‌ت به‌ هه‌راو كێشه‌ی (راهن) و (مرتهن) نامه‌یه‌كم بۆ (ئیبن عه‌بباس) نووسی، ئه‌ویش وه‌ڵامی بۆ نووسیمه‌وه‌و گوتی: ((ان النبـي (ﷺ) قضى أن اليمين على المدعى عليه))[٥٣]

پێغه‌مبـــه‌ر (ﷺ) بـــــۆ كۆتایی هێنانی كێشه‌ی نێوان ئه‌و دووانه‌ بڕیاری دا كه‌: (داوا لێكراو ده‌بێ سوێند بخوات).



(٥٢) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب الرهن) (٢٥١٣/٥).

(٥٣) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب الرهن) (٢٥١٤/٦).

## ٥ - بەخشیین، یان هیــبــە

### پێشەكیی:

بە توێژینەوەو لێكۆڵینەوە لە بەرنامەو شەریعەتی ئیسلام گەورەیی و مەزنیی و فەزڵی ئەو دینە وەدیار دەكەوێ، بەتایبەت بۆ نەیارانیی و ناحەزانی، چونكە ئەم ئیسلامە هەرچۆنێ گرنگی دەدا بۆ پتەوكردنی پەیوەندییەكانی نێوان مرۆڤ و خوای پەروەرێنیی، هەر ئاواش بایەخ دەدات بۆ ئاسوودەیی و هێوریی كۆمەڵگەی ئادەمیی، من دەڵێم دەیان، تۆ بڵێ صەدان، هەزاران خاڵ و بەندی تۆماركردووە لەسەر هاوكاریی و هەماهەنگیی و پێكەوە ژیانی مرۆڤەكان بە تەبایی – لەسەر ئەم هەسارەی زەمینــــــە – هەر لە ئەخلاقییاتیی و ئاشتیی و جەنگیی و ئابووریی و سیاسیی و قۆناغەكانی كۆمەلأیەتیی، یەكێ تر لەوانە مەسەلەی بەخشین و دەست و دیاریی و خێرو صەدەقەو چاكە بەرامبەر یەكتــركردن، دیارە ئەمانە گشت بۆ جۆشدانی برایەتیی و كۆمەڵگەی ئینسانەكانە پێكەوە، ئەو كە دەفەرمووێت: ((تهادوا فإن الهدية تذهب وحر الصدر..)) (٥٤) با لەنێو یەكتــردا دەست و دیارییتان هەبێت بۆ یەكدی، چونكە دیاری كینەو رك و ساردی دڵەكان بەرامبەر یەكتــر ڕا دەماڵێ، مەبەستی هەر تۆكمەكردنی پەیوەندی كۆمەڵگەیە، جا لەم نووسینە كورتەشدا – وەك عادەت و نەریتی ئەم زنجیــرەیە – مەسەلەی بەخشیین، یان بڵێین: (هیبە)و كێشەكانی دەخەینە پێش چاو، بەو هیوایە پتــر ئیسلاممان لاخۆشەویست ببێت. هۆمێدم هەمیشە خۆشیتانە..

**هەڵەبجەی شەهیدان**

**٥/ جومادی یەكەم/ ١٤٢٤ی كۆچی**

**٤/ تەمووزی/ ٢٠٠٣ی زاییـنی**



---

(٥٤) ضعيف، ضعفه الشيخ الالباني في ضعيف الجامع برقم: ٢٤٨٩. بە ریوایەتێكی تر هاتووە كە دەفەرموێ: (تهادوا تحابوا) ئەم ریوایەتەیان شێخی ئەلبانی بە حەسەنی داناوە لە (صحيح الجامع) دا بە ژمارە: ٣٠٠٤.

# گەورەیی و مەزنیی بەخشیین و دنە دنەی موسڵمانان بۆی

ئەبوو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((یا نساء المسلمات.! لاتحقرن جارة لجارتها ولو فرسن شاة))[٥٥]. ئەی ژنانی موسڵمان.! نابێ هیچ دراوسێیەك ئەو شتەی دەینێرێ بۆ دراوسێکەی بەکەمی دابنێ، ئەگەرچی سمە مەڕێکیش بێت و هەر پێشەو پەلاش بێت.

مەبەست لەم فەرموودە ئەمەیە کە دەبێ دراوسێ بەرامبەر بە دراوسێی خۆی خاوەن دەست و دەهندە بێ و هەمیشە لە بەخشش و دیاری بۆی دەست کۆتا نەبێ، ئەگەرچی زۆر کەمیش بێت، وە یان هیچ کەسێك دیاریی و دەهندە بە کەم نەزانێ ئەگەرچی زۆر کەم و بچووکیش بێت، لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((یا نساء المؤمنین.! تهادوا ولو فرسن شاة، فإنه ینبت المودة ویذهب الضغائن))[٥٦] ئەی ژنی موسڵمانەکان.! هەمیشە دیاریی و دەهندە بنێرن بۆ یەکتــر ئەگەرچی سمە پەزێکیش بێت، چوون دیاری خۆشەویستی لە دڵ و دەروونداا دەڕوێنێ و ڕك و خەشمیش وەلا دەنێ.

گرنگی ئەم هیبەو بەخشیینە مەگەر هەر وڵاتە هەژار نشیینەکان بیزانن، هەزار ساڵ لەمەوبەر چاك زانراوە چەندە بە کەڵك و بە نرخ بووە، کە کشت و کاڵ و مەزراو ئاوو ئاوەدانی زۆر کەم بووە، پیشەسازیی و کەشاوەرزیی زۆر لە دوا بووە، هێڵی بە یەك گەیشتنی ئەم گوند بۆ ئەو گوند، یان ئەم شار بۆ ئەو شار نەبووە – ئیتــر با وڵاتە دوورەکان بووەستێ – خەڵکێکی بێ

---

(٥٥) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ کتاب الهبة /٢٥٦٦).

(٥٦) قال الحافظ: رواه الطبراني من حديث عائشة" أخرجه الطبراني في "الأوسط" (٥٩٣٧) عن محمد بن محمد التمار البصري ثنا شيبان بن فَرُّوخ ثنا الطيب بن سلمان قال: سمعت عَمْرة تقول: سمعت عائشة تقول: قال رسول الله –صلى الله عليه وسلم–: فذكره. وقال: لم يَرو هذا الحديث عن عمرة بنت أرطأة –وهي العدوية بصرية، وليس بعمرة بنت عبد الرحمن– إلا الطيب بن سلمان المؤدب، ويُكنى أبا حذيفة، بصري ثقة". قلت: ذكره ابن حبان في "الثقات"، وقال الدارقطني: ضعيف. ومحمد التمار ذكره ابن حبان في "الثقات" وقال: ربما أخطأ. وشيبان بن فروخ قال أبو داود وغيره: صدوق.

نەواو نەدار، ئا لەم کاتانەدا چەند گرنگە دراوسێکان چاوییان لە یەك بووبێ، هەرچی خوا دابێتی بۆی بنێریێ، ئەوە بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بە خاتوو عائیشەی دەفەرموو: (ئاوی زۆر بکە مەرەگەو چێشتە شلەکەوە، با بگات بە گشت دراوسێکاندا، ئێستاش ولأتە لاف لێدەرەکانی دیموکراسی لەسەر دۆلار دەخۆن و دەخەون، بەلأم ڕۆژانە سەدان ئافرەت و منداڵ و پیــرەمێرد لە برساندا دەمرێ..!! بێگومانبە هەموو گەڕەك و کۆڵانێکی گشت جێیەك هەژارو نەداری تێدایە، ئەگەر هەر ئەوەی کە نیوەڕوان و ئێواران ژنان دەیکەنە سەتڵی زبڵەکەوە بە دیاریی و دەهندە بنێرن بۆ دراوسێکانیان – بێ لە درووستبوونی خۆشەویستی – ڕك و کین لە دڵ دەڕواو پتــر گشت دەبنە براو خوشك و، دەبنە یەك خێزان و یەك ئوسرە.

خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) بۆ دنە دنەو هەڵنانی موسڵمانان ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە: بە (عوروە) دەڵێ: خوشکەزاکەم.! سوێند بەخوا سێ جار مانگی نوێمان دەدیت، واتە: دوو مانگی ڕەبەق لەسەر یەك لە هیچ ماڵێکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاگر نەدەکرایەوە – بۆ نان و چێشت –، عوروە دەڵێ: گوتم: پووری.! باشە بە چی دەژیان.؟! خاتوو عائیشە گوتی: تەنیاو تەنیا بە ئاوو خورما، شایانی باسیشە برێ دراوسێی (ئەنصار)یمان هەبوو زۆر بە دەهندەو بەخشش بوون، گەلێ جار شیــریان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەناردو گشتمان پێکەوە دەمان خـــــوارد..!

<u>ڕێنمایی ئەم فەرموودەیە:</u>

یەکەم: گەورەیی و مەزنی بەخشین.

دووەم: گێڕانەوەی پیاوەتیی و کاری جوامێرانەی مەردم ڕەوایە.

سێیەم: باسی هەژاریی و نەداری خۆت ڕەوایە، بەتایبەتی ئەوەی ماوەی بەسەرچووە.

چوارەم: خۆ بەکەم زانین و (**تواضع**)ی پێغەمبەر (ﷺ) لەناو دراوسێکانیدا.

پێنجەم: دەهندەو بەخشیین لەلایەن بچووكەوە بۆ گەورەو، قبووڵكردنی.

شەشەم: خۆڕاگرتنی خێزان و هاوسەرەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەو حاڵەتە ناهەمـــــوارە..!!

حەوتەم: دەبێ دراوسێ ئاگایان لە ژیان و ژیواری یەكتـــر بێـت.

هەشتەم: چەندە كاری جوامێرانەیە كە دەسدارانی گەڕەك ئاگایان لە نەدارانی گەڕەك و كـــــــۆڵان بێـــــت.



## شتی کەمیش دەبەخشـــرێت

ئەبوو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((**لو دعيت إلى ذراع أو كراع لأجبت، ولو أهدى إلي ذراع أو كراع لقبلت**))[57]. ئەر بانگ بکرێم بۆ سەر دەعوەتی دەستە حەیوانێکیش، یان بۆ دەعوەتی سمە حەیوانێ، بۆی دەچم، ئەگەریش هەرکامێکیشیان بە دیاریی و دەهندە بینێرن بۆم قبووڵمـــەو وەری دەگرم..!!

بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر جۆشدانی خۆشەویستی نێوان موسڵمانان، بەتایبەتی بۆ تۆکمەکردنی پەیوەندی نێوان بانگبەرو مەردمەکە ئەوپەڕ (**تواضع**)و خۆ بە کەمزانیین خەرج دەکا.! چەندە گرنگە گەورەو بچووك بەو شێوەیە بئاڵێن بە یەکاو شەرم و پەردە نەمێنێ، بچووك بوێرێ دەعوەتی مامۆستاکەی بۆ شۆربایەکیش بێت بکات، چەندە سەرفرازە کۆمەڵگەی ئاوا (تەصەننوع) و (تەکەللوف) لە نێوانیاندا نەبێ، زۆر بە ئاسانەو تەوازوعەوە لەماڵی یەکتــر نـــــــان بخۆن، گشت کەس لە ڕێکی خۆی بەخبەخ لەو ڕەوشتە بەرزەی پێغەمبەرە (ﷺ).!! لەو نەفسە بەرزو پاکەی دەڵێتەوە.!



(٥٧) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ کتاب الهبة)(٢/ ٢٥٦٨).

## لە بەخششی منالأنیشدا دادپەروەر بن.!

بوخاریی (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: بەخشینی هەرشتێ بە هێندێ لە منالْ ڕەوا نییەو دانامەزرێ، هەتا بەوانی تریش دەبەخشێ بە ئەندازەی ئەوە، ئەوسا ئەو فەرموودەیە دێنێ: ((اعدلوا بين أولادكم في العطية))(٥٨) واتە: لە بەخشینی نێـــو منـــاڵـــەکانتـــاندا دادپـــەروەر بـــن. !

(عامیــر) دەڵێ: نوعمانی کوڕی بەشیــر لەسەر میمبەر قسەی دەکردو گوتی: بابم بەخششێکی دامێ، ئەوسا (عەمرە)ی دایکم کە کچی (ڕەواحە)ی خوشکی (عەبدوڵلأی)ی کوڕی (ڕەواحە)یە گوتی: هەتا پێغەمبەر (ﷺ) شایەت و ئاگادار نەبێ ڕازی نابم لەم بەخشینە، پاشان باوکم چوویە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گوتی: من شتێکم بەخشییوە بە نوعمانی کوڕم کە لە عەمرەی کچی ڕەواحەیە، ئێستا عەمرە دەڵێ: دەبێ بچییە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو بزانێ. ! پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((أعطيت سائر ولدك مثل هذا.؟)). باشە. ! هەر وەکو لەوەت بە منالەکانی ترت داوە.؟ بەشیــر گوتی: نەخێر. ! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((فاتقوا الله واعدلوا بين أولادكم)) لە خوا بتــرسن. ! دەبێ لەناو منالأنتاندا دادپەروەربن، ئیتــر ئەمیش کە گەڕایەوە لێی وەرگرتەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((أكل ولدك نحلت مثله.؟). قال: لا. قال: فارجعه))(٥٩).

(ئەبی حەییان) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە باوکی نوعمان: ((لاتُشهدني على جور)) (٦٠) واتە: بۆ شتی ناهەق و ستەم هەرگیز مەمگرە بە شایەد، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((لا أشهد على جور)) (٦١) .

---

(٥٨) أخرجه: البخاري (فتح الباری/كتاب الهبة ١٢/ ٢٤٤٧).

(٥٩) أخرجه: البخاري (فتح الباری/كتاب الهبة) (١٢/-١٣)(٢٥٨٦ – ٢٥٨٧).

(٦٠) صحيح البخاري –كتاب الشهادات، باب : لا يشهد على شهادة جور إذا أشهد – حديث : ٢٥٢٨

(٦١) صحيح البخاري –كتاب الشهادات، باب : لا يشهد على شهادة جور إذا أشهد – حديث : ٢٥٢٨

واتە: من نابمە شایەدی کاری ناهەق و ستەم، یان هاتووە: ((فلاتشهدنی إذاً، فإني لا أشهد على جور)) [٦٢] ئەمەیش هاتووە: ((فإني لا أشهد على جور، ليشهد على هذا غيري)).. یان: ((إن لهم عليك من الحق أن تعدل بينهم، كما أن لك عليهم من الحق أن يبروك)) [٦٣] یان: ((سو بينهم))[٦٤] گەلێ ڕیوایەتی تر، کە هەموو پشتگیرن بۆ یەکسانی نێوان منالآن لە بەخشییندا.

بەڵێ... ڕاگرتنی دڵی خاوو خێزان و، فەرق و سوون نەکردن لە نێوانیاندا واجبێکی ئیسلامییەو پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دووپاتی کردووەتەوە، تا کێشەو هەرایان لێ پەیدا نەبێت و دەرەنجام پەرِاگەندە نەبن و یاسای خێزان هەڵنەوەشێتەوە، تەنانەتی ڕۆژێك حوشترێکی لە (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب) کڕیی و دایە (عەبدوڵلاّ)ی کوڕی عومەرو پاشان فەرمووی: ((..فاصنع به ماشئت)) [٦٥] دەسا مەیلتە چی لێ دەکەی.

زاناکان دەڵێن: ئەگەر ڕەوا بوایە بە هێندێ لە منالّ بەخشین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دەدا بە عومەر حوشترێکی بدایە بە عەبدوڵلاّ، بەلاّم کە فەرمانی نەداو خۆی ئەو کارەی کرد، مانای ئەوەیە جیاکردنەوەی منالآن لە بەخشین دا ناڕەوایە.

بێ سۆ ئەم کارەی کە ئەمڕۆ هەندێ لە باوکان دەیکەن: پارچەیە زەویی، یان پارچە باخێك دەدەنە کوڕێکیان و ئەوانی تری لێ بێ بەش دەکەن، ئەنجامێکی زۆر خراپی لێ دەوەشێتەوە، ڕك و کینە هەڵگرتن لە یەکدی، تەنانەتی هەندێ جار پەلاماری کوشتن لە یەکتردان و ڕێ بە یەکترگرتن، بەتاییەت ئەگەر کوڕەکان بەرەی دوو ژن بن، جا بۆ ڕێ گرتن لەسەر هەڵنەدانی ئەو ئەنجامە خراپانە پێویستە زانا بەڕێزەکانمان ڕێگەی ئەو کارەیە نەدەن و تەنیا پەیڕەوی لە فەرموودەکان بکەن و، دوای (تەئویل)و تەفسیر بۆ فەرموودەکان

(٦٢) صحيح مسلم –كتاب الهبات، باب كراهة تفضيل بعض الأولاد في الهبة – حديث : ٣١٤١
(٦٣) صحيح، صححه الالباني في سنن أبي داوود: ٣٥٤٢.
(٦٤) صحيح، صححه الالباني في المجتبى من السنن سنن النسائي: ٣٦٨٦.
(٦٥) صحيح، صححه الالباني في إرواء الغليل برقم: ١٣٢٧.

نەکەون، چونکە ئەو توندو تیژییەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەر بەو ناهەقیی و ستەمە دەیکا، دەرگا داخستنی ئەو کارەیە بە تەواویی.

جەماوەری زاناکانیش یەکسانی نێوان منالاّن بە کارێکی (سوننەت)ی دادەنێن و بە دە جۆر (تەئویل)ی ماناو مەبەستی فەرموودەکانیان کردووە.! وەك لە (فتح الباري)دا هاتووە.

دەمێنێتەوە ئەمە کە ئاخۆ باوك دەتوانێ لە بەخشینەکەی خۆی پەشیمان ببێتەوە..؟

جێگەی قسەو باسی زاناکانە، ئەگەرچی ئەوانە ڕێگە دەدەن پەشیمان ببێتەوە ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە: ((لايحل لرجل يعطي عطية أو يهب هبة فيرجع فيها إلا الوالد فيما يعطي ولده..)) [٦٦] واتە: بۆ هیچ پیاوێ حەڵاڵ نییە، پاش دەست و دیاریی و بەخشین پەشیمان ببێتەوە، مەر هەر تەنیا باب بۆ کوڕیی، ئەو دەتوانێ بیداتێ و لێیشی پەشیمان بێتەوە، واتە: بۆ خەڵکانی تر پەشیمان بوونەوە نییە.

ئیمامی بوخاریش دەڵێ: (باب لايحل لأحد أن يرجع في هبته وصدقته). بۆ هیچ کەسێك ڕەوا نییە هەر کە شتێکی کردە صەدەقە، یان بەخشی پەشیمان ببێتەوە بەدەر لە باوك.

دوایی ئەم فەرموودانە دێنێ:

١- ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) فەرمووی: (العائد في هبته كالعائد في قيئه)[٦٧]. مرۆڤی هەڵگەڕاوە لە بەخشییندا هەر وەکو کەسێکە بڕشێتەوەو ئەوسا هەڵسێ بیخواتەوە، ئەوەندە کارێکی ناشیرین و ناپەسەندە، دیارە خواردنەوەی ڕشانەوە حەرامە، کەوابوو هەڵگەڕانەوەو پەشیمانیش لە بەخشین، یان لە صەدەقە هەروا. کۆڕی جەماوەری زاناکانیش دەڵێن: هەرکە شتێك بەخشراو لەلایەن پێبەخشراوەکە وەرگیراو، ئیتر حەرامە لێساندنەوەی، مەگەر باوك.

(٦٦) صحيح، صححه الالباني في سنن أبي داوود: ٣٥٣٩.

(٦٧) أخرجه: البخارى (فتح البارى/ كتاب الهبة) (٣٠/ ٢٦٢١).

٢- ((ليس لنا مثل السوء، الذي يعود في هبته كالكلب يرجع في قيئه))[٦٨]. واتە: حەق نییە ئێمەی ئیماندار خۆ بشووبهێنین بە شتی پەستەوە، بەڵام پیاو هەق بڵێت کەسێکی پەشیمان بووەوە هەر لەو سەگە دەچێت دەڕشێتەوەو پاشان دەشیخواتەوە..! ئەوەندە کارێکی قێزەون و نا جوامێرانەیە، پەشیمان بوونەوە لە بەخشیین و لە صەدەقە.



(٦٨) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ كتاب الهبة) (٣٠/ ٢٦٢٢).

## بەخشینی قەرز

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((من كان له عليه حق فليعطه او ليتحلله منه))(٦٩). هەرکەسێك قەرزێکی لەسەرە، دەبێ یا بیداتەوە پێی، یان گەردنی پێ ئازادکا. جابیــری کوڕی عەبدوڵلاّ (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: لە ئوحوددا باوکم شەهید بوو و قەرزار بوو، ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) لە قەرزارەکانی خواست کە بەرووبووی باخەکەم وەرگرن و بابم ئازاد بکەن.

بەڵێ... ئازادکردنی قەرزار لە قەرز بێ سۆ کارێکی ڕەوایەو هیچ کێشەیەك لەناو زاناکاندا نییە، بەڵکو ئەوی کێشەبێ ئەمەیە: ئاخۆ دەتوانێ قەرزەکەی لای ئەو کەسەیە بیبەخشێ بە کەسێکی تر.؟



(٦٩) أخرجه: البخاری (فتح الباری/کتاب الهبة) (٢١).

# قەبووڵکردنی دیاریی لە موشریکان

عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: (١٣٠) کەس بووین لە تەك پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی: ئاخۆ کەسێکتان خواردنێکی پێ نەبێ.؟ لەو خەڵکەیە تەنها پیاوێك مەنێ خۆراکی پێ بوو و کرایە هەویر. ! پاشان پیاوێکی موشریکی زۆر کەڵەگەت هات و مەڕێکی پێبوو لێیدەخوڕی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە فرۆتن دەیدەیت یان بە بەخشیین.؟ پیاوە موشریکەکە گوتی: نەخێر، بەڵکو بە فرۆشتن، ئەوسا مەڕەکەی لێکڕاو کرایە مەرگەو چێشت، بەلاّم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانییدا کە جگەرو دڵەکەی ببرژێنن، سوێندم بەخوا بەشی تەواوی (١٣٠) کەسەکەی لێ جیاکردەوە ئەوسا دوو تیانچەیان لێ پڕکردوو هەمومان لێمان خواردو تێربووین و هێشتای لێشییان مایەوەو بە حوشتر بردمانەوە.[٧٠]

ئەمە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەو کەسە موشریکە دەپرسێ: ئاخۆ پێمان دەفرۆشیی، یان پێمان دەبەخشیی، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەر بە دیاریی و بەخشینیش بێت لێی وەردەگرن. ئەوەندە هەیە کە دەبێ بەو بەخشینە کابرای پێبەخشراو نەکەوێتە ژێر تەئسیری بەخشەرەکەوەو لە ئەنجامدا بتوانێ کاری ناپەسەندو ناشەرعیی پێ بکا.

وە پێبەخشراوەکەش بتوانێ لەو ڕێگاوە هۆگریی و پەیوەندییەك لەگەڵ بەخشەرەکەدا گرێ بداو بەرەو دینی ئیسلام ڕێنمایی بکات لە سۆنگەی ((تهادوا تحابوا...)) [٧١].

بێجگە لەمەش پێغەمبەر (ﷺ) هێسترێکی سپی جوان و عەبایەکی سەرشانی لە پاشای (ئەیلە)وە بە دیاری بۆ هات و قبووڵیشی کرد.

(ئەنەس)یش (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ژنێکی جوولەکە مەڕێکی ژەهراوی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) قبووڵی کردو لێیشی خوارد (بەلاّم خوا پاراستیی و کاریگەری نەبوو لەسەری)

---

(٧٠) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ کتاب الهبة) (٢٨/ ٢٦١٨).

(٧١) حدیث حسن، حسنه الالباني في صحیح الجامع: ٣٠٠٤.

**پاشان گوتیان: ڕێمان بدە با بیکوژین.! (چونکە خۆی پێی لێناو گوتی ویستوومە بەمە بیکوژم)، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی نەدا بکوژرێ، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەتا کۆچی دوایی کرد ئاسەواری ئەو گۆشتە ژەهراوییە بە دەم و لێـــــویـــیـــــــەوە دیاربوو..!**



## دەست و دیاریی بۆ موشریکان

ئەسمای کچی ئەبی بەکر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: لەنێوان پەیمانەکەی حودەیبییەو فەتحی مەککەدا دایکم کە هەر لە سەردەمی نەفامییدا باوکم تەڵاقی دابوو موشریکە بوو هاتە لام، منیش لە پێغەمبەرم پرسی: دایکم هاتووەو دەیەوێ بمبینێ و لەوانەیشە دەست و دیاری پێ بێ و، چاوەڕوانی لە منیش بکا، ئاخۆ ڕێگەم دەدەیت.؟ فەرمووی: ((**نعم صِلِي أمكِ**))[٧٢]. بەڵێ.. حەقی دایکایەتی جێبەجێ بکە.

**ڕێنمایی ئەم فەرموودەیە:**

١- موسڵمان دەبێ (ئیلتیزام)ی تەواوی هەبێ بە بەرنامەی ئیسلامەوەو گومانی لـــــە هـــــەرشتـــێ هەبێ ئاخۆ شەرعیی بێ یا نا، لێی ڕاوەستێ، تا بۆی ڕوون دەبێتەوە.

٢- گوفتارو ئاکاری چاك لەگەڵ بابەو دایە - ئەگەرچی خوا نەناسیش بن - واجبێکی ئیسلامییە، تەنانەتی ماڵ و دارایی و نەفەقە بۆ خەرج کردنیان.

٣- دوورە پەرێزی لە کافران - ئەگەرچی لە وەختی ئاگربەستیشدا (**هدنة**) بێ فەرمانێکی ئیسلامییە.

٤- ڕێگەی دوورگرتنە بەر بۆ سەردانی خزم و کەس و کار ئاکارێکی جوامێرانەیە.

٥- ئیبن عویەینە دەڵێ: ئایەتی: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾(الممتحنة: ٨). لە بارەی ئەو موشریکانەوە کە زۆر بە ئەمەك و ئاکار چاکبوون بەرامبەر بە موسڵمانەکان هاتە خوارێ و ڕێی پێدان کە لە تەکیاندا ئەمانیش جوامێرانە ڕەفتار بکەن، چونکە خوا ڕێ لەوانە ناگرێ چاکەیان لەگەڵ بکرێ کە نە جەنگ دەکەن لەگەڵ موسڵماناندا و نە تێدەکۆشن بۆ دەرکردن و دەرپەڕاندنیان لەسەر عەرزو ئاوی خـــــۆیان.

**خوێنەری خۆشەویست و بە ئەمەک.!**

بە تەمام لەم زنجیرەی پێنجەمەش کەڵك و سوود وەرگیـرابێ، تۆش خـــوا یارو یاوەرت بێ.



(٧٢) أخرجه: البخارى (فتح البارى/كتاب الهبة) (٢٩/ ٢٦٢٠).

# ٦- سەلەم

## پێشنووس:

ئێمە دڵنیاین کە هەموو شتێ لە ڕووی ئەم زەوییەدا خوای گەورەو باڵادەست بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکانی درووستکردووە، وەکو خۆی دەفەرموویت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌ ﴾(البقرة:٢٩). دیارە هەرچی پاك و خاوێن بێت دەرگای بۆ والاَ کردووە بچێ سوودی لێ وەرگرێ: ﴿ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴾ (المائدة: ٨٨). یەکێ لەوانە کڕین و فرۆشتن و بازرگانییە، دیارە (سەلەم)یش — کە کڕینی شتێکی نەدیتــراوە — لە بەرژەوەندی ئینسانەکانە ڕێی پێدراوە، ئەگینە، لەبەر ئەوە — کە شتی نادیار نافرۆشرێ — دەبوو ئەمەیش ڕێی پێ نەدرابا، جا لەم زنجیرەی شەشەمەدا باسێکی کورتی (سەلەم) دەکەین و کێشە کۆمەڵایەتییەکانیی و چارەسەریی لە ئیسلامدا، هیواداریـن پتر مەزنیی و لێهاتوویی شەریعەتی ئیسلاممـــان بۆ وە دەرکەوێ.

هەڵەبجەی شەهیدان

٢٩ / ١٤٢٤/٥ ی کۆچیی



## سەلەم:

زاناکانی شەرع دەڵێن: سەلەم یان (سەلەف) بریتییە لە تەسلیمکردنی (عیوەز)و بریتیەیەکی ئامادەو بەردەس لە بەرامبەر (عیوەز)ێکی پەسەندکراو لە گەردندا تا کاتێکی دیارییکراو.

زاناکان گشت یەکدەنگن بۆ شەرعییەتی سەلەم مەگەر (ئیبنول موسەییب)، بەڵام لە مەرجەکانی دا کێشەو هەرایانە، ئەگەرچی هەموو دەڵێن: دەبێ مەرجەکانی (بەیع) لە سەلەمیشدا بێنە دێ و دەشبێ هەر لەو دانیشتنەدا سەرمایەکە تەسلیم بکرێت، دیارە لەبەر ناچاریی و پێویستی مۆڵەت دراوە، ئەگینە — لەبەر ئەوە فرۆشراوەکە نادیارە — ڕەوا نییەو دانامەزرێ.

ئیبن عەبباس دەڵێت: ئەو دەمە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە خەڵکەکەی سەلەمی لە خورمادا کردبوو بۆ ماوەی ساڵێك و دوو ساڵ، ئەوسا فەرمووی: ((من سلف في تمر فليسلف في كيل معلوم و وزن معلوم))[٧٣]. هەرکەسێك بە خورما سەلەم بدا دەبێ پێوانەو کێشانەکەی دیاری بکرێت، واتە: ئەگەر بە پێوانە بوو دەبێ بڵێ بە مەنی عێـراق، یان بە مەنی سولەیمانی، یان بە مەنی ئەو جێگایەی تێیدا دەژیین.

فەرموودەی ژمارە (٢٢٤٠) دەڵێت: ((من أسلف في شيء ففي كيل معلوم و وزن معلوم إلى أجل))، ژمارە (٢٢٤١)یش دەڵێت: ((في كيل معلوم و وزن معلوم الى أجل معلوم)) واتە: هەرچی بە کێشانە بوو بە کێشانە، هەرچیش بە پێوانە بوو بە پێوانەو ماوەکەیشی دیاری بکرێت، بەڵام ئاخۆ دەبێ شتی پێوانە بە کێشانە، یان بەپێچەوانەوە..؟ شافیعییەکان پێیان ڕەوایەو دەبێ.

عەسقەلانی دەڵێت: وشەی (في شيء) کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، مانای وایە کە سەلەم لە ئاژەڵ و پاتاڵیشدا دەبێ.

---

(٧٣) أخرجه: البخاري (فتح الباري/كتاب السلم) (١/ ٢٢٣٩).

<u>بە کورتی</u>: هەر شتێك ئەو کۆمەڵگەیە پێویستی پێی هەبێ و بتوانن بێ هەراو کێشەو قیمەت و بەهاکەی بدەن و ئـــەویش لـــە کاتی خۆیدا – وەکو چۆن پەسن کراوە – پەیدا ببێ، درووستەو ڕەوایە، وەکو (ئیبن قدامە)ی مەقدیسی – کە لە ساڵی (٧٣٠)ك، کۆچی دوایی کردووە – لەسەر (مختصر)ەکەی (ئەبوول قاسم) کە ساڵی (٣٣٤)ی کۆچی، لە دونیا دەرچووە – دەڵێت: (قال أبو القاسم: وكـــل مـــا ضبط بصفة فـــالسلم فيه جائز). کەوابوو دانەوێڵەو ئاردو جل و بەرگ و ئاوریشم و خووریی و موو کورك و کاغەزو ئاسن ... هەروەها لە خۆراك و نان و خواردندا ڕەوایە سەلەم بکـــرێت.



## سەلەمی شتێک لای کەسێک کە ئەو شتەیەی نەبێ لە وەختی سەلەمەکەدا

بوخارییش بۆ ئەمە دەڵێت: (باب السلم إلى من ليس عنده أصل)، جا بۆ ئەمە ئەم فەرموودەیە دێنێ: (موحەممەدی ئیبن ئەبولجالید) دەڵێت: دوو کەس لە هاوەڵان ناردمیان بۆ لای (عەبدوڵڵای)ی ئیبن ئەبی ئەوفا (خوای لێ ڕازی بێت) گوتیان: بپرسە: ئاخۆ هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە گەنمدا سولفەیان ئەکرد.؟

عەبدوڵڵاش گوتی: ئێمە لەو عەرەبانەی — زمانیان تێك چووبوو بە هۆی تێکەڵی بە عەجەمەکانەوە — لە شام دادەنیشتن گەنم و جۆو زەیتمان بە سەلەم دەدانێ بە پێوانەیەکی دیاری کراو بۆ کاتێکی دیاری کراو. گوتم: ئەوانە لە بنەڕەتدا گەنم و جۆیان هەبوو.؟ گوتی: ئێمە پرسیارمان لەوە نەدەکرد: ئاخۆ ئەو کەسە پارەکە دەبا بە سەلەم ئەو شتەی هەیە یا نا.؟ پاشان ناردمیان بۆ لای هاوەڵێکی تر — عبدالرحمن بن ئەبزا — هەمان پرسیارم لێ کرد گوتی:

((كان أصحاب النبي (ﷺ) يسلفون على عهد النبي (ﷺ) ولم نسألهم ألهم حرث أم لا))[٧٤]. هاوەڵان سولفەیان دەدا — لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) — لێشییان نەدەپرسیین: ئاخۆ جووت و گاو کێڵگەیان هەیە یا نا..؟!

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ((في الحنطة والشعير والزبيب))[٧٥]. واتە: لە گەنم و جۆو مێوژدا سولفە دەکرێت.! ئەم فەرموودەیە دەبێتە بەڵگەی ئەمە کە دیاریکردنی شوێنی تەسلیمکردنی سولفەکە مەرج نییە، بەڵام بۆ ئەوەی بۆ دوایی نەبێتە هەراو کێشەیان وا چاکە هەموو شتێك لە کاتی (عەقد)ەکەدا ببڕێتەوە.



(٧٤) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب السلم) (٣/ ٢٢٤٥).
(٧٥) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب السلم) (٣/ ٢٢٤٥).

## دەستە بەر بوون و بارمتە
## (الكفالة والرهن) لە سەلەمدا:

سەبارەت بە کەفالەت و ڕەهن لە سەلەمدا، ئیمامی بوخاری دەڵێت ئەم دوو فەرموودەیە دێنێ:

* خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ((إشترى رسول الله (ﷺ) طعاما من يهودي بنسيئة، ورهنه درعا له من حديد))[٧٦]. واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردەمەنییەکی بە قەرز لە جوولەکەیەك کڕیی و، کڵاوخوودە لە ئاسن درووستکراوەکەی خۆی کردە ڕەهن و بارمتە لای جوولەکەکە.

* خاتوو عائیشە دەڵێت: ((إشترى رسول الله (ﷺ) من يهودي طعاما إلى أجل معلوم، وارتهن منه درعا من حديد))[٧٧]. پێغەمبەر (ﷺ) لە جوولەکەیەك خۆراکێکی بۆ کاتێکی دیاری کراو کڕیی و کڵاوخوودە لە ئاسنەکەی بە ڕەهن لە پێغەمبەر وەرگرت. ئەم دوو فەرموودەیە ئەگەرچی تەنیا ڕەهنی تێدایە، بەڵام زاناکان (کەفیل)یش دەلکێنن بە ڕەهنەوە، واتە: کە مۆڵەتی ڕەهن درابێ و کرابێ – لەبەر نەفەوتانی ماڵی ئەو کەسەیە – دیارە کەفیلیش باشتــر ئەو ڕۆڵە دەبینێ، کەوابوو ئەمیش ڕەوایە.



(٧٦) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب السلم) (٥/ ٢٢٥١).

(٧٧) أخرجه: البخاري (فتح الباري/ كتاب السلم) (٦/٢٢٥٢).

# ئەر ساڵهات و سەلەم تیاکراوەکە نەبوو..؟!

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((من أسلف في شيء فلا يأخذ إلا أسلف فيه أو رأس ماله))[٧٨]. هەرکەسێك سەلەمی لە هەر شتێکدا کردو پاشان کاتی دیاری کراو هات و هیچ نەبوو وەری گریَ، بۆی نییە لەباتی ئەو شتێکی تر داوا بکات، مەگەر دەستمایەکەی خۆی وەرگرێتەوە.

بەڵێ... ئەوە کە بۆتە کێشە لە (سەلەم)داو گەلێ جار ناهەقیی و ستەمیشی تێدا دەکریَ ئەمەیە کە: کەسێك دەڕوا لای کەسێکی تر پارەیەك دێنیَ بە سەلەمی (بۆ نموونە) لۆکە، ئەوسا کە وەختی وەرگرتنی هات، ڕێکدەکەوێت لۆکەی کابرا تیاچووبێ — بەهەر هۆیەکەوە بێ — خاوەن پارەکەشی دەڵێ: دەبڕۆ ئەوا شکاندمەوە بۆت بۆ ساڵێکی ترو دەبێ دوو ئەوەندە بدەیت. !

واتە: ئەگەر تەنێ پەمووی لەسەر بووبێ ئێستا هەر بە هەمان پارە دەیکاتە دوو تەن لەسەری، ئەمیش لە ناچارییدا قبوولی دەکاو، ئیتر دەبێ لە ژێر قەرزی ئەودا هەر بناڵێنێ..
جا بۆ ئەوە ئەو کارە ناهەقییە نەکریَ پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەو فەرموودە جوانەی هێناو بە کابرای خاوەن سەرمایەی فەرموو: تۆ دووشتت بۆ هەیە:

یەکەم: چاوەڕوانبە هەتا کابرای سەلەم هێنەر شتە سەلەم تێدا کراوەکەی دەست دەکەویَ ئەمساڵ، یان ساڵێکی تر، چوون بۆت نییە پێی بگۆڕی لە باتی لۆکە (بۆ نموونە) گەنم وەرگرییت، وە یان دوو بەرامبەری کەیت لەسەری. !

دووەم: بێ زیادو کەم دەتوانی سەرمایەکەت وەرگریتەوە ئەگەر بووی، ئەگینە دەبێ بێ ئەزییەت و ئازار مۆڵەتی بدەیت هەتا دەستی دەکەوێت، وە یان گەردنی ئازاد بکرێت.

---

(٧٨) رواه الدارقطني. وضعفه الالباني في إرواء الغليل برقم: ١٣٨٥.

خوێنەری بەڕێزو بینەری هێژا.! ئاشکرایە کە سەلەم چاوپۆشی تێدا کراوە، ئەگینە بەپێی یاسای کڕین و فرۆشتن ڕێی پێ نادرێ – وەك باسمانکرد – ئەم ڕێدانەش لە "سەلەم" بەرژەوەندیی هەم هەژارەو هەم دەوڵەمەند، هەژار ناتوانێت زەوییەکەی بکات بە کشت لەبەر نەداری، قەرزیشی دەست ناکەوێ، دەڕواتە لای دەوڵەمەندێك ئەوەندە پارە دێنێ کارەکانی خۆی پێ ئەنجام دەداو، لەولایشەوە دەوڵەمەندەکە قازانج و سوودی وەردەگرێت، بێگومانیشە کە مەبەست لەم جۆرە شتانەدا زیادکردنی بەروو بووی وڵاتەو پەرەپێدانە بۆ بازرگانیی و هەوڵ و کۆشان بۆ زیاد بـــــوونی دەسمایە.

لە خوا دەخوازین کۆمەڵگەی ئیسلامیی هەردەم لە گەشەی ئابووریدا بێ و بتوانێ خۆی لە دەست کورتیی و نەبوونی ڕزگار بکا، هەتا گەردنیشی نەچێتە نێو پەتی کۆیلایەتییەوە، ئەوساش لەبەر نەبوونیی، دین و وڵاتی خۆی لە دەست بداو تەسلیمی بێگانە ببێ.

**ئیتـــر لەم مەسەلەی سەلەمەدا خوات لەگەڵ بێ و هەمیشە لە پەنای خوادا بیت.**

**١٤٢٤/٦/٢ی کۆچیی**

**٢٠٠٣/٧/٣١ی زایینی**

**هەڵەبجەی شەهیدان**



# ٧- شوفعە

**خوێنەری هێژا!**

چاك بزانە كە شەریعەتی ئیسلامیی پیرۆز هەموو هەوڵێكی دەخاتە گەڕ بۆ دابینكردنی هێوریی و، ئەمن و ئاساییشی نێو كۆمەڵگە، بۆ ئەمەش سەدان هێڵی ڕاست و چەپی دیارییكردووە، گرتنی هێڵە ڕاستەكان مایەی پاراستنی ئاشتیی و (سەلام)ــە بۆ تاك و كۆمەڵ، هەر بۆیە لە مەسەلەی كڕین و فرۆشتنیشدا، دەبێ بەرژەوەندی یەكتــر ڕەچاو بكرێ، بۆ نموونە ئەگەر دراوسێییەك، وە یان خزمێك كاتێك ئەیەوێ باخێ، وە یان پارچە زەوییەك، وە یان خانوویەك بكڕێ، یان بیفرۆشێ بەر لە فرۆشتنی خزمەكەی خوێ، یان دراوسێكەی ئاگادار بكا، بزانێ ئەو نایەوێ، ئەوسا بیدات بە كەسانێكی تر، هەر ئەمەیە كە لە كتێبە فەرموودەو فیقهییەكاندا — بەتایبەتی — باسی (شوفعە) كراوە، بەڕاستی شتێكی گرنگە، دەبێتە مایەی مانەوەی خۆشەویستیی و خزمایەتیی و، بەختیاری نێو خێزانە دراوسێكان، لەولایشەوە هەر لە خۆوە، بێ ڕەزامەندی دراوسێكان چەند ناپەسەندو ناجۆرە خانوویەك یان پارچەیەك زەوی بكڕدرێ یان بفرۆشرێ.

هیوادارم هەموو لایەك ڕیعایەتی بەرنامەكانی ئیسلامیی پیــرۆز بكەین لە گشت جم و جوولــــەكاندا، ئیتــر هەر شادبن.

**٥ /٦/١٤٢٤ی كۆچیی**

**٢٠٠٣/٨/٣ی زایینی**

**هەڵەبجەی شەهیدان**



## شوفعه:

<u>شوفعه</u>: به مانای جوفت و هاولف، وه یان به مانای هاوکاری هاتووه، لێرەش چوون بەشی یەکێکیان دەدرێته پاڵ ئەویان، دەبێته شوفعه، لەلای شەرع زانەکـــان بریتیه لــــه: (إنتقال حصة شريك إلى شريك كانت إنتقلت إلى أجنبـي بمثل العوض المسمى) گــــــواستنەوەی ئــــەو بـــــەشە شەریکەیە کەوتۆتە دەستی کەسێکی نەیارو بێ پەیوەندیی بەو ماڵەوە، بۆ شەریکی فرۆشیارەکــــە هەر بە هەمان (عیوەن)و بریتیی.

ئیمامی بوخاری لە (جابیــر)ەوە (رضي الله عنه) ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((قضى النبـي (ﷺ) بالشفعة في كل مالم يقسم، فإذا وقعت الحدود وصرفت الطرق فلا شفعة)).(٧٩)

بەڵێ.. بەپێی فەرموودەو (ئیجماع)ی زاناکان شوفعه هەیەو کاری پێکراوە، ئەوەی کە فەرموودەیە وەك ئەم فەرموودەیە جابیــر ڕیوایەتی کرد: ((قضى النبـي (ﷺ) بالشفعة....))، ئیمامی (نەسائی)یش ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((قضى رسول الله (ﷺ) بالشفعة في كل شركة لم تقسم ربعة وحائط لا يحل له أن يبيعه حتى يؤذن شريكه فإن شاء أخذ وإن شاء ترك وإن باع ولم يؤذنه فهو أحق به)) (٨٠).

واتای فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنن کە: هەرشتێ – هاوبەش بێت – هێمان بەش نەکرابێ و سنوورەکانی لێکجیا نەکرابێتەوە شوفعەی تێدایەو پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری لەسەر داوە، خۆ ئەگەر کابرای شەریك، بەشەکەی خۆی فرۆت و هاوبەشەکەی خۆی ئاگادار نەکرد، دیارە هاو شەریکەکەی شایستە ترە پێیی و مافی ئەو زێدەترە تا کابرایەکی تر کە هیچ پەیوەندییەکی پێوەی نەبێ، بۆیە هەق، هەقی ئەمە.

(٧٩) أخرجه: البخاری (فتح الباري / كتاب الشفعة: ١/٢٢٥٧)
(٨٠) صحيح، صححه الالباني في سنن النسائي: ٤٧٠١.

**(ئیبن مونزیر) دەڵێ..: (أجمع أهل العلم على إثبات الشفعة للشريك الذي لم يقاسم فيما بيع من أرض أو دار أو حائط). دەستەی زانایان بە كۆی دەنگ لەسەر ئەوەن كە: هەر زەویی و خانوو و باخێك هاوبەش بێت و بەش نەكرابێ و، ئەوسا فرۆشرا، هاوبەشەكەی مافی شوفعەی هەیەو ئەتوانێ ئەو فرۆشتنە هەڵوەشێنێتەوە.**



## هاوبەش بەر لە فرۆتنی بەشەکەی، دەبێت هاوبەشەکەی خۆی ئاگادار بکا

(عومەری کوڕی شەریید) دەڵێت: لەلای (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص)دا بووم، (میسوەری کوڕی مەخرەمە) هاتوو دەستێکی خستە سەرشانم، ئا لەو کاتەدا (ئەبوو ڕافیع)ی بەندەی پێغەمبەریش (ﷺ) هاتوو وتی.! دەمەوێت ئەو دوو هۆدەیە — کە لە ناو خانووەکەی تۆدایە — لێمی بکڕی. سەعد وتی: سوێندم بەخوا نایکڕم. (میسوەر) گوتی: سوێند بەخوا دەیانکڕیت. سەعد وتی: دەسا من تەنها (٤٠٠) دیناری زێڕم پێ دەدرێت، ئەویش دەبێت بە (قیست) و بە چەند بەشێك بیدەم، واتە: پارەی حازرم نییە. ئەبوو ڕافیع گوتی: ئاخر بەر لە تۆ (٥٠٠) دیناری زێڕم دراوەتێ، دڵنیابە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کە لە پێغەمبەرم بیستووە ئەیفەرموو: ((..الجار أحق بسقبه..)) [٨١] دراوسێ بە هەق ترە — بۆ کڕینی ماڵی دراوسێ — بەهۆی نزیکییانەوە، ئەر لەبەر ئەم فەرموودە نەدەبوو، هەرگیز نەم ئەدا بە (٤٠٠) هەزار دینای زێڕ، چونکە پتر لەوەم پێ دراوە، ئیتــر بە (٤٠٠) هەزار دیناری زێڕ پێی فرۆشت.

ئیمامی (تیـرمیزیی) لە (جابیــر)ەوە ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((الجار أحق بشفعته ينتظر به وان كان غائبا إذا كان طريقهما واحدا)) [٨٢].

ئەبوو حەنیفە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم فەرموودانە دەکاتە بەڵگەی شوفعە لەبەر دراوسێیەتی، بەڵام زاناکانی تر دەڵێن: مەبەست بەم وشەی (جار)و دراوسێیەتیە: هاوبەش و شەریکە، چونکە (ئەبوو ڕافیع) هاوبەشی (سەعد) بوو لە خانووەکەدا، نەك مافی دراوسێیەتی بێت.

(٨١) صحيح البخاري –كتاب الشفعة، باب عرض الشفعة على صاحبها قبل البيع – حديث : ٢١٦١.
(٨٢) صحيح، صححه الألباني في الجامع الصحيح لسنن الترمذي: ١٣٦٩.

(بلوغ المرام) به ژماره (٩٤٢) دەڵێت: (وفي ريواية الطحاوي: قضى النبـي (ﷺ) بالشفعة في كل شيء) ورجاله ثقات [٨٣]. بەپێی ئەم فەرموودەیە شوفعە لە هەموو شتێکدا دەبێت: دابەش بکرێت، یا نا، بگوێزرێتەوە، یا نا..؟ ئەگەرچی جێگەی کێشەو هەرایە. بەپێی ئەم فەرموودانەی سەرەوە: هەر شتێك فرۆتنەکەی ببێ بەهۆی دڵ نیگەرانی دەرو دراوسێ (گوازراوە بێت، یا نا، هاوبەشی بێت، یانا). شوفعەی تێدا دەبێ و، (قازیی) دەتوانێت بۆ بڕانەوەی ئەو کێشانە خۆی شتێك هەڵبژێرێ و بڕیاری لەسەر بداو گوێ بە کێشەو ناکۆکی زاناکان نەدا، منیش وا دەزانم ئەمە باشتـرین چارەسەر بێت بۆ نەهێشتنی کێشە کۆمەلأیەتییەکانی (شوفعة).

ئەمەیش کورتەی ڕاو بۆچوونی (شافیعی)ییەکانە لە شوفعەدا: (والشفعة واجبة بالخلطة دون الجوار، فيما ينقسم دون ما لا ينقسم، وفى كل ما لا ينقل من الأرض كالعقار وغيــره، بالثمن الذي وقع عليه البيع، وهي على الفور، فإن أخرها مع القدرة عليها بطلت...) متن الغاية والتقريب ل(أبي شجاع).

واتە: شوفعە تەنیاو تەنیا لە ماڵی شەریکیی و تێکەلأودا دەبێ، دەشبێ بە کەڵکی دابەشکردن بێت، وە لە هەموو شتێکی گوازراوەو نەگوازراوەدا وەکو زەویی... هتد. بەو پارەیەی بەیعەکەی پێکراوە ڕەوایە، ئەم شوفعەیشە دەس بەجێ دەبێ، خۆ ئەگەر لەگەڵ تواناادا پشت گوێی خست — داوای شوفعە بکا — مافی دەسووتێت.



(٨٣) إسناده ضعيف؛ ابن جريج مدلس وقد عنعن. أخرجه: الطحاوي في «شرح المعاني» (٥٨٨١). انظر: «الإلمام» (١٠٧٣)، و«المحرر» (٩٣٩). تعليق المحقق على كتاب بلوغ المرام الدكتور ماهر ياسين الفحل.

# ٨ - وەسیەت و ڕاسپاردن

## وتەیەکی پێویست

ئەوی لەناو ئەم دینی ئیسلامەدا — بە باشی — نەژی، نازانیٚ چەندە گرنگە، نازانیٚ چۆن مرۆڤ پەروەردە دەکات بەرامبەر بە خۆیی و، بەرامبەر بە خزم و کەس و کاریی و خەڵکانی تری دەورووبەریی! لەلایەکەوە دنە دنەی دەدا — بەتایبەتی لەو سەردەمەدا کە دونیا سەرجەم برسیەتیی و قات و قڕییە — بۆ بەخشین و خێرو صەدەقە، کاتێك لە ژیاندا بێت، وە یان بۆ ماوەی پاش مردنیی، وەکو (وەصییەت و وەقف) و چەندین پرۆژەی خێری تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت (تەصەروف)ێکی وا بکات زیان بە ئوسرەو خاووخێزانی بگەیەنێت، بە تایبەتی لەو کاتەدا نزیکی مەرگ دەبێتەوەو دەیەویٚ وەصییەت بکات: سەرجەم ماڵەکەی — بۆ نموونە — پاش خۆی بۆ مزگەوت بێت، لە بەرامبەر هەر جم و جووڵێکی ئاوادا، مرۆڤ بەرپرسە لە خۆیی و لە خەڵکانی ژێر دەستی، چ لە ژیاندا، چ بۆ پاش مردن، نابێت زیان بە خۆیی و خەڵکانی تر بگەیەنێت، کاتێك کە (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) نەخۆش دەبیٚ و پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەچێتە سەرەخۆشیی و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا.! دەمەوێت وەصییەت بکەم پاش خۆم ماڵەکەم گشت صەدەقەو خێری هەژاران بێت.؟! ئەویش (ﷺ) ڕێی پیٚ نەدا، ئەوسا دەیەوێت نیوەی بکاتە صەدەقە، دیسان هەر ڕێگای پیٚ نەدا، هەتا دێتە سەر سێیەك، ئەوسا دەفەرمووێ: باشە سێیەکی بکە صەدەقە، سێیەکیش کەم نییەو، پاداشتی زۆر دەبێت، چونکە خاوو خێزانت بە تێرو تەسەلی بەجیٚ بهێڵی باشتــرە، هەتا دەست لەم و لەو پان بکەنەوە.... هتد. جا بە پشتیوانی خوای میهرەبان باسی (وەصیەت)و (وەقف) دەکەین و، ئەو کێشانەی پەیدا دەبن لە ئەنجامدانیانەوە. هیوادارم سوودبەخش بێت بۆ هەموولایەك.

هەڵەبجەی شەهیدان:

٩ / شەعبانی/١٤٢٤ ی کۆچیی

٥ / ١٠ / ٢٠٠٣ ی زایینیی



## وەصیەت و ڕاسپاردن:

**خوای گەورە دەفەرمووێت:** ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ (البقرة: ١٨٠) **واتە: لە سەرتان نووسراوە کە هەرکات کەسێك لە ئێوە هاتە سەر مردن و، ماڵێکی لە پاش دەمێنیٚ، بەشێوەیەکی خواپەسەند وەسییەت بکا کە دایك و باوك و خزمانی، هەرکەسیٚ بەشی خۆی پیٚ بگا، ئەنجامدانی ئەم کارە پێویستە بۆ خۆ پارێزان.**

**پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ما حق امرىء مسلم له شيء يوصى فيه يبيت ليلتين إلا ووصيته مكتوبة عنده))[٨٤]. واتە: دەبیٚ موسڵمان ئاوا لێبڕاوو هۆشیار بیٚ کە: هەمیشە وەسییەت نامەکەی لەلای سەریا بێت، چونکە نازانێت کەی مردن لە دەرگای دەدا. بۆیە ئیـتـر تەواوی موسڵمانان هاودەنگن لەسەر وەسییەت کردن، بەڵاّم بۆ ئەمە کە: ئاخۆ (واجیب) بێت، یان (سوننەت) هەراو کێشەیانە، سەبارەت بە کەسێك قەرزار بێت، وە یان ئەمانەت و ڕاسپاردەیەکی لابێت، بیٚ شك بۆ ئەو کەسە وەسییەت واجیبە، ئەگینە سوننەتە.**

**لە فەرموودەدا هاتووە: ((ما ترك رسول الله عند موته درهما ولا دينارا ولا عبدا ولا أمة ولا شيئا، إلا بغلته البيضاء وسلاحه وأرضا جعلها صدقة))[٨٥] کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتیٚ مرد، نە پارەو پوول و، نە بەندەو کەنیـزەو، نە هیچ شتێکی تری بەجیٚ نەهێشت، مەگەر هێسترە سپییەکەیی و چەکەکەیی و، پارچە زەوییەکیشی هەبوو کردییە صەدەقەو خێر بۆ ڕێبواران.**

**واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەوەیشدا، ڕێی پێدرا بوو دنیا داری بکات، هیچ بایەخی بە دونیاو مـــاڵی دونیا نـــەدەدا، بۆیە کە دەمریٚ شتێك نییە، پاش خۆی بەجیٚ بمێنیٚ و، وەصییەتی تیا بکات.**

---

(٨٤) أخرجه: البخارى (فتح الباري/ كتاب الوصايا) (١/ ٢٧٣٨).

(٨٥) أخرجه: البخارى (فتح الباري/ كتاب الوصايا) (١/ ٢٧٣٩).

ئیمامی (بوخاریی) لە (ئەسوەد)ەوە دەڵێ: لای خاتوو عائیشە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت) گوتیان: دەڵێن: (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) پاش پێغەمبەر (ﷺ) (وصیی)و هەقبەدەستە، واتە: پێغەمبەر لە جێی خۆی دایناوەو دەبێتە خەلیفەی ئەو..! خاتوو عائیشەش (خوا لێی ڕازی بێت) گوتی: ((متى أوصى إليه وقد كنت مسندته إلى صدري، أو قالت: حجري – فدعا بالطست، فلقد إنخنث في حجري فما شعرت أنه قد مات، فمتى أوصى إلي علي.؟)) [٨٦]. خۆ ئەو سەری بە سنگیی منەوە بوو و ئاگام لە هەموو شتێکە، دەبێ کەی ئەو وەسیەتەی بۆ کردبێت..؟! واتە: نە وەسییەتی بە سێیەکی ماڵ و نە بە شتی تر کرد، چونکە هیچ شتێکی بەجێ نەهێشت، وە نە وەسییەتیشی بۆ (عەلیی)و غەیرەز (عەلیی) کرد کە پاش خۆی خەلیفە بێت.

(فتح الباری) دەڵێت: (قال القرطبي: كانت الشيعة قد وضعوا أحاديث في أن النبي (ﷺ) أوصى بالخلافة لعلي، فرد عليهم جماعة من الصحابة ذلك، وكذا من بعدهم، فمن ذلك ما أستدلت به عائشة... ومن ذلك أن عليا لم يدع ذلك لنفسه، ولا بعد أن ولي الخلافة، ولاذكره أحد من الصحابة يوم السقيفة..)[٨٧]. قورتوبی دەڵێ: شیعە بە لایەوە وایە: پێغەمبەر (ﷺ) وەسییەتی کردووە کە: (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) پاش ئەو خەلیفە بێت، بەڵام کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵان و پاشینان ئەوەیان بە ڕاست نەزانیوە، چونکە:

یەکەم: خاتوو عائیشە گوتی: من هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم و شتی وام لێ نەبیستووە.

دووەم: عەلی – بۆ خۆیشی – هیچ کات داوای نەکردووە.

سێیەم: ڕۆژی (سەقیفە)ش کەسێ لە هاوەڵان، ئەوەی وە بیر نەهێنایەوە، هەتا باسێك لە (عەلی) بکرێت.

(٨٦) صحيح البخاري – كتاب الوصايا، باب الوصايا وقول النبي صلى الله عليه وسلم : وصية – حديث : ٢٦٠٩

(٨٧) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ كتاب الوصايا/ ٥).

ئەمەو کۆمەڵێ بەڵگەی تر کە هەر لەوێ – فتح الباری – باسیان دەکات.

پێشەوا (نەواوی)یش دەڵێت: (... ولا أوصى إلى علي (رضى الله عنه) ولا إلى غيره، بخلاف ما يزعمه الشيعة...)[88] واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هیچ کەسێك وەسییەتی نەکردووە، پاش خۆی خەلیفە بێت، بە پێچەوانەی بڕواو بۆچوونی شیعە.

تێهەڵکیشی ئەم باسی (عەلیی)ـە (خوای لێ ڕازی بێت) لە دانانی جێگر (خەلیفە، وەلی عەهد)ەوە سەر هەڵدەدات، جا لەبەر ئەوە، ئەم باسی ئێمەیە، جیاوازە لەو، پەردەی لێ دادەین و هەڵی دەگرین بۆ جێگای خۆی، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە ورووژاندنی ئەو باسە، تەنها نەیارو ناحەزانی ئیسلام، پێی بەهرەمەند دەبن، بەتایبەتی بۆ ئێستا، کە نەیارانی ئیسلام لە هەموو لایەکەوە دەیانەوێ گەمارۆی ئیسلام بدەن.

**وەصیەت:** دەستوورێکی کۆنی ئادەمزادە، بەر لە ئیسلامییش هەبووە، بەڵام – دیارە – جێگەی قسەو باس بووە، ستەم و ناهەقیی زۆری تێداکراوە.

**ڕۆمانییەکان:** بێ سنوور مافیان بە سەرداری خێزان دابوو کە: چۆن دەسکاری لە ماڵ و سامانیدا دەکا، دەیتوانی وەصیەت بکات بۆ نەیارێکی ئەو خێزانە، وە یان هێندێ منالی لێ بێ بەش بکات، پاشتـر هاتە سەر ئەوە کە دەبێ: (٤/١) یەك لەسەر چواری دارایی بپارێزرێ بۆ ماڵ و خێزان، بە مەرجێ کە ئەو میراتگرانە، کارێکی نابەجێ – بەرامبەر – سەرۆك خێزانەکە نەکەن ببێتە مایەی دڵ نیگەرانیی.

**عەرەبەکانی پێش ئیسلامیش:** بۆ خۆ هەڵکێشان و کــەش و فشی خـــۆیان، وەصیەتیان بۆ خەڵکانی دوورو نا خزم دەکردو، خزم و کەس و کــاری خـــۆیانیان بە هەژاری دەهێشتەوە..! بەڵام ئیسلام هات، بە هەڵەکانیاندا چووەوەو، ددانی بە وەصیەتدا نـــا لـــەسەر ئەساس و بناغەی (هـــەق) و (عەدل).

(٨٨) سەیری: صحيح مسلم بشرح النووي/ كتاب الوصية/ ترك الوصية لمن ليس له شيء يوصى فيه.

بەر لەوە یاسای میرات دابمەزرێنیّ، پێویستی کرد کە: وەصییەت بۆ باوك و دایك و خزم و کەس و کاری نزیك بکرێت، پێویستی کرد کە: دەبیّ وەصیەت بکریّ بە باوك و دایك و خزمە نزیکەکان و تەواوی دارایی و ماڵەکەی بدریّ بەوان. ئەوجا کە ئایەتەکانی سوورەتی (نیساء) هات و یاسای میراتی دابەزاند، وەصییەتـــــی بــــــەست بە دوو مەرجەوە:

١- ڕەزامەندی میراتگرەکان - پاش مردنی وەصیەتکار - چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە وتارەکەی حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: ((إن الله قد أعطى كل ذي حق حقه، فلا وصية لوارث))(٨٩) فەرموودەیەکی موتەواتیرەو دوازدە هاوەڵ ڕیوایەتیان کردووە. واتە: خوا مافی هەموو کەسی دیاریکرد، کەوابوو - پاش ئەوە - کەس بۆی نییە وەصیەت بکات بۆ میراتگر، جا پاش ئەوە کە مافی (بابەو دایە) دیاریکرا بە ئایەتەکان، وەصیەت بۆ خزمانی نزیکی بیّ بەش لە میرات بە (سوننــــــەت) مایەوە.

٢- دیاریکردنی سنووری لای سەرووی (وەصیەت) بە (٣/١) یەك لەسەر سیّ)ی ماڵ، لەبەر ئەوە کە کاتیّ (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) ویستی نیوەی میراتەکەی، وە یان (٣/٢) دوو لەسەر سێیی) دوای خۆی بکرێتە خێرو صەدەقە، چونکە تەنها کچێکی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((الثلث، والثلث كثير، إنك أن تذر ورثتك أغنياء خير من أن تدعهم عالة يتكففون الناس)).(٩٠). واتە: سێیەك، هێمان سێیەکیش زۆرە، بیّ شك میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندیی جیّ بهێڵیت، لەوە باشتــرە بە هەژاریی ماڵ ئاواییان لیّ بکەیت و، دەست لەم و لەو پان بکەنەوە.(٩١)

(ئیبن عەبباس، حەسەن، تاوس، مەسرووق، زەحاك، موسلیمی ئیبن یەسار)و چەندین زانای تر لە هاوەڵان و پاشینان، دەڵێن: دەبیّ بۆ ئەو کەس و کارە نزیکانە، میرات نابەن،

(٨٩) حسن صحيح، قاله الالباني في تحقيقه على سنن أبي داوود: ٢٨٧٠.

(٩٠) صحيح البخاري - كتاب الوصايا، باب أن يترك ورثته أغنياء خير من أن يتكففوا الناس - حديث : ٢٦١٠

(٩١) سەیری: (الفقه الإسلامي وأدلته)ی دکتۆر وەهبە زوحەیلی- بکە.

وەصییەت بکرێت شتێکیان بۆ دیاری بکرێت، (تەبەریی)ش هەر ئەمەی هەڵبژاردووە. بێ لەو ئایەتەی سوورەتی (بەقەرە)، لە سوورەتی (نیساء)شدا هاتووە: ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾(النساء: ٨).

(قورتوبی) دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەو کەسانە میراتیان ناکەوێ و، لەخزمانی نزیکن، وە یان هەتیوو مسکینن، دەبێ ڕێزیان بگیـرێ و بێ بەش نەکرێن. جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتانەوە دەردەکەوێ کە: هێندێ جار ئەوە کە "مامە" منداڵە هەتیوەکانی ئەو برایەیان بێ بەش دەکەن، بەر لە بابە گەورەیان بابیان مردووە، کارێکی زۆر نا بەجێ و ناپەسەندە لە شەریعەتی ئیسلامدا، وە زۆر بێ ویژدانییشە. بــۆیە داوا لـــــە گشت مـــوسڵمـــــانـــــان دەکەین کـــە ئـــاگـــاداری داواکـــــاری ئەو ئایەتە بن و پشتگوێی نەخەن.



## لە سەرەتای گشت وەصییەتنامەیەکەوە

(عەبدولرەزاق) دەڵێت: (ئەنەس) گوتی: هاوەڵان لەسەرەتای هەموو وەصیەتنامەیەکەوە دەیان نووسی: ((بسم اله الرحمن الرحيم، هذا ما أوصي به فلان بن فلان يشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله وأن الساعة آتية لا ريب فيها وأن الله يبعث من في القبور وأوصى من ترك من أهله أن يتقوا الله ويصلحوا ذات بينهم ويطيعوا الله ورسوله إن كانوا مؤمنين وأوصاهم بما أوصى به إبراهيم بنيه ويعقوب يا بني إن الله اصطفى لكم الدين فلا تموتن إلا وأنتم مسلمون))[٩٢]. واتە: هەر بەناوی خوای خاوەن بەزەیی و میهرەبان، ئەمە وەصیەتنامەی (..........) گەواهی تاك و تەنیایی خودا دەداو، موحەممەدیش (ﷺ) بەندەو ڕەسووڵی خودا دەزانێ، دەشزانێ هاتنی ڕۆژی سەلاّ، هیچ گومان و دوو دڵییەکی تێدا نییەو، خەڵکانی مردووی نێو گۆڕ زیندوو دەکرێنەوە، بە خاوو خێزانیشی دەڵێ: خۆ لە خوا بپارێزن و، نێوان خۆتان چاك بکەن و، بەر فەرمانی خواو پێغەمبەر بن (ﷺ) ئەر باوەڕدارن، هەر چۆنێکیش – کاتی خۆی – (ئیبراهیم و یەعقوب "سلاّوی خوایان لێ بێت") کوڕەکانیان ڕاسپارد کە: هەتا ئەو ڕۆژە دەمرن، هەردەم ئیماندار بن و، لە دینی ئیسلام کلا نەبن.

بەڵێ... دەبێ هەموو شتێك هەر بە ئیزن و فەرمانی خوا بێت، پێویستیشە هەتا ئەو ڕۆژە ئەمریین، لە ماڵ و منالّمان بێ ئاگاو کلا نەبین، هەوڵی دینداریی موسڵمانییەتیان بدەین و، قبووڵ نەکەین لە دین لابدەن، تەنانەتی لەکاتی مردنیشدا – لەبەر گرنگیدان بە مەسەلەکە – دەبێ ئەمە خاڵێکی گرنگی وەصیەتنامەمان بێت، کە جێی دێڵین بۆ ماڵ و منالّ.



(٩٢) مصنف عبد الرزاق الصنعاني –كتاب الوصايا، باب كيف تكتب الوصية – حديث : ١٥٧٦٩، وصححه الالباني في إرواء الغليل برقم: ١٦٤٧.

## وەصیەت بۆ..؟

ئەر لە دەسەلاَت و توانایی وەسیەتکارەکەوە — پاش مردن — سەیری مەسەلەی وەصیەت بکەین، دەبوو کارێکی نادرووست و ناڕەوا بووباو، ڕێی پێ نەدرابا، چونکە وەصیەت پاش مردن جێبەجێ دەکرێت، ئەو دەمەش کابرای وەصیەتکار مردووەو چووە بە ڕێی خۆیدا، دەکرا کەس گوێ بۆ قسەی نەگرێ، بەتایبەتی کە ئەو ماڵە پاش ئەو، مافی ئەوی پێوە نەماوەو، بۆتە میراتی میراتبەرەکان..!

هەقە ئەر گوێی بۆ شل نەکرێت، بەلاّم شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام — لەگەڵ ئەوەیشدا — لەبەر بەرژەوەندیی وەصیەتکارەکە خۆیی و، بەرژەوەندی خزم و کەس و کاریی و، کۆمەڵ و کۆمەڵگە، ددانی پێدا دەنێت، بەرژەوەندی مردووەکە — پاش خۆی — ئاشکرایە، چونکە لای خوا مزەو پاداشتی بۆ ئەنووسرێ و، لە تۆمارگای ئاکار چاکانیش — بۆ دونیا — ناوی دەنووسرێت.

خزمانیشی — لەو ڕووەوە بەهرەمەندن — کە زۆربەی کات، وەصیەت بۆ ئەوانەیان دەبێ کە: بەپێی یاساو دەستووری میرات، میراتیان ناکەوێ، بەلاّم خوا ئەو وەصییەتەی فەرز کردووە هەتا شتێك دابنرێت بۆیان لە کەلەپوورەکە.

کۆمەڵگەش — لەو ڕووەوە قازانجییەتی — کە زۆرینەی وەصیەت بۆ کارە گشتییەکانە، وەکو دروستکردنی نەخۆشخانەو، قوتابخانەو، مزگەوت و ڕێگەو بان، وە یان بۆ چاکسازی ئەوانە ئەبێ، خۆ ئەر بۆ هەژارو هەتیو و بێ بابایش بێت، ئەوە باشتر ئاشکرایە، بۆیە (وەصیەت) بە بڕگەیەکی گرنگی دەسەبەرێتیی کۆمەلاّیەتیی (التكافل الاجتماعی) دادەنرێت لەلای ئیسلام.(٩٣)

دەبێ هەمیشە ئەوەمان لە بیر نەچێ کە: پەسەندکردنی (وەصییەت) و ددان نان پێیدا، لەو سەردەمە لێڵەدا، لەو حەلە پڕ لە هەژاریی و نەدارییەدا، دەگەڕێتەوە بۆ خەمخۆری ئەم

(٩٣) الفقه المنهجي/ كتاب الوصية/ حكمة مشروعية الوصية.

ئیسلامە بۆ چارەسەری کێشەو گیرو گرفتەکانی نێو کۆمەڵ، ئەر بیر لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر بکرێتەوە، کە تاك و کۆمەڵ – هەردوو – چەندە دواکەوتوو بوون و، چەندە نەبوو و، دەست کورت بوون، ئەوسا لە هەل و مەرجێکی ئاوادا، دینی ئیسلام ئەو گشت بەرنامانە دێنێ بۆ خۆشگوزەرانیی و فەرەحی مرۆڤ، بێ شك گەورەیی و مەزنی ئیسلام پتر پرشنگدار تر دەبێ لای هەمووان.

(ئیبن حەزم) ئەڵێت: (مسألة: وفرض على كل مسلم أن يوصي لقرابته الذين لايرثون، إما لرق، وإما لكفر، وإما لأن هنالك من يحجبهم عن الميراث، أو لأنهم لايرثون، فيوصي لهم بما طابت نفسه، لا حد لذلك، فإن لم يفعل أعطوا، ولابد ما رآه الورثة، أو الوصي).[٩٤]

واتە: گشت موسڵمانێکی دارا، دەبێ بۆ خزمە نزیکە میرات نەبەرەکانی خۆی – لەبەر ئەوە کۆیلە بێ، یان خوا نەناس و بێ باوەڕ بێت، وە یان لەبەر ئەوە کەسێك ڕێگربێ لە میراتبردنی، وە یان هەر میراتیان نەکەوێت – وەصیەت بکات، ئەوەندەیان بۆ قایەل ببێ، دڵی پێخۆشکەن، خۆ ئەر پشتگوێی خستن، سوڵتەی سەردەم دەیانداتێ.

ئەم ڕاو بۆچوونە – بەڕای ئێمە – لە هەقەوە نزیکترە، چونکە ئیسلام کۆمەڵگە لەسەر برایەتیی و خۆشەویستیی و تەبایی دادەمەزرێنێ، هەرچیش زیان بەو خۆشەویستییە بگەیەنێت، هەڵیدەوەشێنێت و ددانی پیا نانێت، بۆیە ئەو شتەیش ئەمڕۆ – گەلێ جار – دەبێتە کێشەی کۆمەڵایەتیی، چارەسەری دەکاو، کەسی تەریك ناکات.



(٩٤) المحلى بالآثار لإبن حزم الأندلسي (٨ /١٧٥٣).

## خێرو صەدەقە، کەی بکرێت باشە..؟

بۆ وەڵامی ئەمە ئەبوو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پیاوێك لە پێغەمبەری (ﷺ) پرسی: چ صەدەقەیەك باش و پەسەندترە.؟ ئەویش (ﷺ) فەرمووی: ((أن تصدق وأنت صحيح حريص، تأمل الغنى وتخشى الفقر، ولاتمهل حتى إذا بلغت الحلقوم قلت: لفلان كذا ولفلان كذا، وقد كان لفلان)).[٩٥]

ئەو دەمە سەدەقە خێری زۆرو باشە کە: مرۆڤ لەشساغ و بە تەماع و، بە تەمای دەوڵەمەندی بێ و، ترسی هەژاری هەبێ، نەك دەسی لە ماڵی نەچێت، هەتا گیانی بگاتە قورگیی، جا ئەو حەلە وەصیەت بکاو بڵێ: ئەمە بۆ (......) و ئەوە بۆ (......)، خۆ ئەو بڵێ و نەڵێ – پاش ئەو – ئەو ماڵەی دەبێتە میراتی جێماوانی دوای ئەو. ئاشکرایە خێرو صەدەقە پێش ئەو حاڵەتە، هەروا بژاردنەوەی قەرزو قۆڵە، لە حاڵەتی نەخۆش و، پاش مردن، گەورەترو مەزنتــرە، بۆیە فەرمووی: ((...وأنت صحيح حريص تأمل الغنى..)) چونکە لە کاتی لەش ساغییدا شەیتان هەڕەشە لە مرۆ دەکات، بە هەژاریی دەیترسێنێت و دەڵێت: چووزانیت تەمەن درێژ نابیت و ئاتاج و موتاج ناکەویت، هەر ئەمەیشە قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ ﴾ (البقرة: ٢٦٨).

دەستەیەك لە ساڵحانی سەلەف دەڵێن: خۆشگوزەرانەکان – زۆربەیان – دووجار لەخوا یاخی ئەبن، هەتا لە ژیندان چکووسیی و ڕەزیلی لە دارابییەکەیاندا ئەکەن، کە بەرەو مردنیش نزیك ئەبنەوە زێدەڕۆیی لە خێرو سەدەقەدا دەکەن و، دەیانەوێ هەموو ماڵەکەیان ببەخشن، هەتا بۆ میراتگرەکان شتێك بەجێ نەمێنێت.

(نەسائی)یش نزیك بەم فەرموودەیە دەهێنێ: ((مثل الذي يعتق أو يتصدق عند موته مثل الذي يهدي بعد ما يشبع))[٩٦]، (ئەبووداود)یش ئەم فەرموودەیە دەهێنێت: ((لأن يتصدق الرجل في حياته وصحته بدرهم خير له من أن يتصدق عند موته بمائة))[٩٧]



(٩٥) أخرجه: البخارى (فتح البارى/ كتاب الوصايا) باب الصدقة عند الموت. (٥/٢٧٤٨).

(٩٦) ضعيف، ضعفه الشيخ الالباني في سنن النسائي برقم: ٣٦١٤.

(٩٧) ضعيف، ضعفه الشيخ الالباني في ضعيف الترغيب برقم: ٢٠٤١.

## داراو دەسدار، بۆی سوننەتە: صەدەقە بۆ مردوو بکات

خاتوو عائیشە دەڵێت: پیاوێك بە پێغەمبەری گوت: دایکم مەرگی کتووپڕی کردووە، دەشزانم ئەگەر وا نەبووبا، خێرو صەدەقەی دەکرد، ئاخۆ ئێستا دەتوانم خێری بۆ بکەم.؟ ئەویش (ﷺ) فەرمووی: ((**نعم، تصدق عنها**)).[٩٨] بەڵێ، خێرو صەدەقە لەباتی ئەو بکە.

ئیبن عەباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: سەعدی کوڕی عـــوبـــادە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری پرسیی و گوتی: دایکم مردووە، (نەزر)ێکیشی لەسەرە، ئاخۆ ئەتوانم لە باتی ئەو جێبەجێی بکەم..؟ ئەویش (ﷺ) فەرمووی: ((إقضه عنها)[٩٩] لەباتی ئەو بیدەو جێبەجێی بکە.

<u>ڕێنمایی ئەم فەرموودانە:</u> صەدەقە بۆ مردوو ئەکرێت، وە کەڵکیشی لێ وەرئەگرێت، بەتایبەت ئەگەر کوڕو کچ و وەچەی خۆی بۆی بکات.

پێشەوا موسلیم ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((إذا مات الإنسان انقطع عمله إلا من ثلاثة: إلا من صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعوا له))[١٠٠].

ئیمامی (نەوەویی) دەڵێ: زاناکان دەڵێن: ئەم فەرموودە وا ئەگەیەنێت کە: مرۆڤ هەر کە مرد، کارو کردەشی بنەبڕ ئەبێ، مەگەر لەم سێ ڕێگەوە شتێکی بۆ بچێت: صەدەقەیەکی (جاریی)و بنەمادار، وەکو (وەقف). زانیارییەك، موسڵمانان – پاش خۆی – کەڵکی لێ وەرگرن، منداڵێکی صالح و سەر ڕاست، دەسی بە دوعا بێت بۆ باوك و دایکەکەی. چونکە ئەمانەش هەر دەست و ڕەنگی خۆینیی، کەوابوو بێ شك، خێری (صەدەقە)و (دوعا) بە مردووان دەگات، هەروا قەرز دانەوە بۆی، هەروا حەج بۆ کردنی، ئەگەر قەرزاری حەج بێت، ئەگینە دەچێتە دەروازی (وەصیەت)ـەوە، ڕۆژوویشی بۆ ئەگیـرڕێتەوە، بەڵام قورئان بۆ

(٩٨) صحيح البخاري –كتاب الوصايا، باب ما يستحب لمن توفي فجاءة أن يتصدقوا عنه – حديث : ٢٦٢٨

(٩٩) أخرجه: البخاری (فتح الباری/ كتاب الوصايا) (٢٧٦١).

(١٠٠) صحيح مسلم –كتاب الوصية، باب ما يلحق الإنسان من الثواب بعد وفاته – حديث : ٣١٦٩

**خوێندنیی و ناردنی خێرەکەی بۆیی و، نوێژ بۆ کردنی، ڕای (شافیعیی) و جەماوەری زانایان ئەوەیە کە: بۆی ناچێت و پێی ناگات. ![١٠١]**

**سوپاس ستاییش لە ئەووەل و ئەخیرەوە هەر بۆ خودای دلۆڤان و دەهندە.. وا لە نووسینی ئەم بەشانەی زنجیرە باسی (کێشە کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەریان لە ئیسلامدا) بوومەوە، بە هیوای سوود و کەڵک لێوەرگرتنیی و پابەندبوونی گەلەکەشم زیاتر بە سیستم و سیاسەت و یاساکانی ئیسلامەوە.. هەر لەپەنای خودا دا بن..**

**١٤٢٤ ی کۆچیی بەرامبەر بە ٢٠٠٣ ی زایینیی**

**هەڵەبجەی شەهیدان**



(١٠١) أخرجه: (صحيح مسلم) بشرح النووي (كتاب الوصية) باب وصول ثواب الصدقات إلى الميت.

# پێڕست

